PAREZ BOOKSHOP

چاپا دوویێ

تاقیگەهـ و شرۆڤەکرنا پشکنینێن

# پزیشکی



بەرگێ ئێکێ



نڤیسین

ڕەیان صەدیق سلێڤانەیی

**ناڤێ پەرتووکێ: تاقیگەهـ و شرۆڤەکرنا پشکنینێن پزیشکی**
**نڤیسین: ڕەیان صەدیق سلێڤانەیی**
**بابەت: تەندرۆستی - پزیشکی**
**ژمارا بەرگی: بەرگێ ئێکێ**
**پێداچوونا زانستی: چەندین نوژدارێن تایبەتمەند**
**پێداچوونا زمانی: حەسەن حاجی**
**دیزاینا ناڤەرۆکێ: ڕەیان صەدیق سلێڤانەیی**
**ژمارا چاپێ: چاپا دوویێ (2022)**
**تیراژ: 1000 دانە**
**بها (نرخ): بیست هزار دینار - 20,000 دینار (بەرگێ ئێکێ + بەرگێ دوویێ)**
**ژمارا سپاردنێ: ( 22 / 2676 / - D ) ژ ڕێڤەبەرییا پەرتوکخانێن گشتی / دهوك.**




+964 750 729 6080
Parezbookshop
Parez.bookshop@gmail.com
دهوک - ناڤا بازاری - بەرانبەر سینەما نەورۆز







# پێشەکی

ژ بەر هەژارییا پەرتووکخانەیا کوردی ل دەڤەرا مە د بیاڤێ پزیشـــکیدا، گەلەک جاران پێدڤی پەرتووکەکا ب ڤی شـــێوەیی دبووم، لێ ل چ جهـان ب دەســـت من نەدکەڤـت و من گەلەک دڤیا پەرتووکەکا ب ڤی شـــێوەیی هەبیت. دەمێ من زانی ئەز پێدڤیمە و نینە و کەســێن وەکی من دێ پێـدڤی ڤێ بن من هەولـدا ئەو ڤـالاهیـیا د پەرتووکخـانەیـا مەدا هەی ئەز پڕ بکەم و خواندەڤان ب گشتی و قوتابی و دەرچوویێن بەشێ زانستی و پزیشکی ب تایبەتی مفایی ژێ ببینن.

د بەرگێ ئێکێ یێ پەرتووکێدا من یا هەولدایی ب زمانەکێ سـاکار و سـادە بەحس ل ژمارەیەکا هەرە زۆر ژ پشکنینێن تاقیگەهێ یێن پزیشکی بکەم و شرۆڤە بکەم، من د پەرتووکێدا ب شێوەیەک گشـتی بەحس ل پشکنینێن گرنگ و بەربەلاڤ و دەگمەن یا کری، بەرگێ ئێکێ ژ پەرتووکێ ژ حەفت بەشێن سەرەکی پێکدهێت ژ وان بەشێن (Hematology Tests, Serology Tests, Infections Disease Tests, Tumor Markers Test, Hormone Tests, Virology Tests, Vitamin Tests) هەروەسـا هەر بەشـەك ژ کۆمەکا هەرە زۆر ژ پشـکنینێن گرنگ و بەربەلاڤ و دەگمەن پێکدهێت و هەر پشـکنینەك من ب شـێوەیەکێ تێر و تەسەل شرۆڤەکرییە ل گەل ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینان و هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوون و کێمبوونا ڕێژەیا ئەنجامێن پشـــکنینان و هەروەســـا نیشـــانێن بلندبوون و کێمبوونا ڕێژەیا ئەنجامێن پشکنینان و ڕامانا ئەنجامێن پشکنینان و شێوازێن نڤیسینا هەر پشکنینەکێ و ئەرێ کەنگی و بۆچی پێدڤییە هەر پشکنینەك بهێتە ئەنجامدان و ...هتد. هەردیسان د بەرگێ دوویێ ژ پەرتووکێ دا من ل بەشـێن یازدێ، دوازدێ، سـێزدێ و چاردێ ب شـێوەیەکێ تێر و تەســەل بەحس ل خوین کێشـانێ کریە و هەمی ڕێنما و ئاریشـەیێن د کریارا خوینکێشـانێدا دهێنە ڕوویدان بەحســکرینە ب شـێوەیەکێ گەلەک بەرفرەهـ و ب شـێوەیەکێ تێر و تەســەل بەحس ل ناســاندنا جۆرێن تیۆبا و چاوانیيا بکارهینانێ ل دویڤ جۆرێن جودا یێن پشـــکنینان کریە و...هتد، و هەروەســـا بەحســکرنا ئامیرێن گرنگێن پزیشـــکی یێن تاقیگەهێ و...هتد، و هەروەســـا هندەك ئـامۆژگـاری و پێزانینێن گەلەک گرنـگ ب شــێوەیەکێ زانســـتی و ئەکـادیمی بەحســـکرینە.... ئەڤ پەرتووکە ب تنێ ژ بۆ قوتابی و دەرچوویێن بەشـــێن زانســـتی و پزیشـــکی نینە، بەلکو هەتا کەســێن ئاســایی ژی دشـێن مفایی ژێ ببینن، ژ بەر کو من پێکۆل کریە ل دەمێ خواندنا پەرتووکێ هەمی کەس تێبگەهن و مفایی ژێ وەربگرن، بەلێ ب تایبەت قوتابی و دەرچوویێن بەشێن زانستی و پزیشـکی دشێن زۆر مفایەکێ مەزن ژ پەرتووکێ وەربگرن و ژێ فێربن... ل دووماهییێ هیڤیدارم من شـــیابیت پیچەك ژ ڤالاهییا پەرتووکخانەیا کوردی و ب تایبەت بادینی ژ بۆ زانســـتێ پزیشـــکی ب زمانێ شرینێ کوردی پڕ بکەم.

ڕەیان صەدیق سلێڤانەیی

2021/5/2

# ناڤەڕۆک

## Dep. Hematology Tests

### پشكنینا گشتی یا پێكهاتەیێن خوینێ Complete Blood Count (CBC) Test

پشكنینا گشتی یا پێكهاتەیێن خوینێ ب رێكا ئامیرێ Coulter ی دهێتە ئەنجامدان ژ بۆ پیڤانا پێكهاتەیێن خوینێ یێن جودا، پشـــكنینا گشـــتی یا پێكهاتەیێن خوینێ هاریكارە ژ بۆ دیـاركرن و دەســـتنیشـــانكرنـا چەندین جۆرێن جودا ژ نەخۆشـــییێن خوینێ ژ وان وەكی: هەوكرن، نەخۆشـییێن گرێدایی مەژییێ هەسـتی، سـالاسیمیا، كێمبیا ئاسنی، ...هتد. ئامیرێ Coulter ی د ماوەیەكێ گەلەك كورتدا كۆمەكا پشكنینان پێكڤە ئەنجامددەت.
پشكنین بریتینە ژ:

- پیڤانا رێژەیا هیمۆگلۆبینی HGB.
- پیڤانا رێژەیا خوینێ HCT.
- پیڤانا رێژەیا خرۆكێن سۆر یێن خوینێ RBC.
- پیڤانا تێكرایا قەبارەیێ خرۆكێن سۆر یێن خوینێ MCV.
- تێكرایا رێژەیا هیمۆگلۆبینی د خرۆكەكا سۆردا MCH.
- تیكرایا خەستییا هیمۆگلۆبینی د خرۆكەكا سۆردا MCHC.
- رێژەیا گوهۆرینا قەبارەیێ خرۆكێن سۆر RDW.
- پیڤانا خرۆكێن سپی یێن خوینێ WBC.
- پیڤانا رێژەیا مۆنۆسایتا MID.
- پیڤانا رێژەیا گرانیۆلۆسایتا GRA.
- پیڤانا رێژەیا لیمفۆسایتا LYM.
- پیڤانا رێژەیا پەركێن خوینێ PLT.
- پیڤانا قەبارەیێ پەركێن خوینێ MPV.
- فرەهبوونا دابەشبوونا پەركێن خوینێ PDW.
- پیڤانا تێكرایا خەستییا پەركێن مەزنێن خوینێ LPCR.

## رێژەیا خوینێ Hemoglobin (HB)

هیمۆگلۆبین پرۆتینەکە د ناڤ خرۆکێن سـۆرێن خوینێدا هەبوون یا هەی، مادە یێ هیماتین کو هەر ئەڤ مادەیە رەنگێ سۆر ب خوینێ دبەخشیت، هەروەسا مادەیێ ئاسنی د پێکهاتەیا وێدا هەیە، ل گەل پرۆتینەکێ دی ب ناڤێ گلۆبین هەردوو پێکڤە "هیمۆگلۆبین"ـی دروست دکەن، کارێ سەرەکی یێ هیمۆگلۆبینی ڤەگوهاستنا ئۆکسجین و دوانەئۆکسیدی کاربۆنییە د ناڤ لەشیدا.

### رێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا هیمۆگلۆبینی:

| تەمەن | رەگەز | رێژەیێن ئاسایی | یەکە |
|---|---|---|---|
| نێر (پێگەهشتی) | | 13.5 - 17.5 | grams per deciliter |
| مێ (پێگەهشتی) | | 12.0 - 15.5 | grams per deciliter |
| زارۆکێن ژ نوی ژدایکبووی | | 13.4 - 19.9 | grams per deciliter |



### هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا رێژەیا هیمۆگلۆبینی:

1. بلندبوونا رێژەیا خوینێ.
2. سۆتن.
3. ژیان کرن ل بەرزیا ئاستێ رووییێ دەریایی.

4. نەخۆشییا Polycythemia Vera
5. بکارهینانا هندەك ژ جۆرێن دەرمانان.

## هۆکارێن دبنە ئەگەرێ کێمبوونا ڕێژەیا هیمۆگلۆبینی:

1. کێم خوینی Anemia
2. دووگیانبوون.
3. کێمییا مادەیێ ئاسنی Iron deficiency
4. خوینبەربوون.
5. نەخۆشییێن گرێدایی گولچیسکان.
6. سالاسیمیا.
7. هەوکرن.
8. شێرپەنجا خوینێ.
9. کێمیا ڤیتامین B12 (Vitamin B-12 deficiency)

## کەنگی پێدڤییە پشکنینا هیمۆگلۆبینی بهێتە ئەنجامدان؟

ل دەمێ هەبوونا نیشـانێن بلندبوون یان کێمبوونا ڕێژەیا هیمۆگلۆبینی پێدڤییە پشـکنینا هیمۆگلۆبینی بهێتە ئەنجامدان.

## نیشانێن بلندبوونا ڕێژەیا هیمۆگلۆبینی:

1. خوینبەربوونا دفنێ.
2. سەرئێشان.
3. هەستکرن ب نەئارامییێ.
4. خوهدانەکا زۆر.
5. ئێشانا دەست و پێیان.
6. خوریان.

## نیشانێن کێمبوونا ڕێژەیا هیمۆگلۆبینی:

1. گێژبوون.
2. ماندیبوون.
3. بەردەوام هەستکرن ب لاوازبوونێ.
4. سینگئێشان.
5. سەرئێشان.
6. بلەز لێدانا لێدانێن دلی.
7. هەبوونا ئاستەنگان ل دەمێ هەناسەدانێ.
8. وەرمتنا دەست و پێیان.
9. هەستکرن ب سەرمایێ د دەست و پێیاندا.
10. زەربوونا پیستێ لەشی.

- ب ڤێ یاسایێ د شیاندایە ڕێژەیا هیمۆگلۆبینی بگوهۆڕین ژ بۆ ڕێژەیا خوینێ ب ڕێژەیا سەدی %

  ڕێژەیا هیمۆگلۆبینی * 6.25 = ڕێژەیا خوینێ ب سەدی %

## پشکنینا هیمۆگلۆبینی ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Hemoglobin Test
- Hemoglobin
- Hb
- HgB Test
- Hb Test

## خرۆکێن سۆرێن خوینێ Red Blood Cell (RBC)

خرۆکێن سۆرێن خوینێ بێ ناڤکن بەروڤاژی خرۆکێن سپییێن خوینێ ناڤك یا هەی، خرۆکێن سۆرێن خوینێ ب چاڤ ناهێنە دیتن ب تنێ ب رێکا بکارهینانا مایکرۆسکۆپی د شیاندایە بهێنە دیتن، هیمۆگلۆبین د ناڤدایە، ژ بەرهندێ رەنگێ وان یێ سۆرە، خرۆکێن سۆر هەڤسەنگییا ترش و تفت و ئایۆنان دکەن، رۆلێ هەی د دیارکرنا جۆرێن گرۆپێ خوینێدا ژ بەر هەبوونا Antigen ێ تایبەت ل سەر خرۆکێن سۆرێن خوینێ، کارێ سەرەکی یێ خرۆکێن سۆرێن خوینێ ڤەگوهاستنا ئۆکسجینێیە ژ سیهان بۆ لەشی و هەروەسان ڤەگوهاستنا دوانەئۆکسیدی کاربۆنێ ژ بۆ سیهان، پاشان ژ سیهان دچیتە ژ دەرڤە ب رێکا هەناسەدانێ، ئەگەر رێژەیا خرۆکێن سۆرێن خوینێ کێم بیت شانەیێن لەشی رێژەیا پێدڤییا ئۆکسجینێ ناگەهیتێ یا لەش پێدڤی، هەروەسا ئەگەر رێژەیا خرۆکێن سۆرێن خوینێ بلند بیت دێ بیتە ئەگەرێ پێکڤەنسیانا خرۆکێن سۆر ب ڤی شێوەیی دێ بیتە ئەگەرێ گرتنا موولوولەیێن بچویکێن خوینێ ب ڤی شێوەیی ڤەگوهاستنا ئۆکسجینێ ژ بۆ شانەیێن لەشی دێ ب زەحمەت کەڤیت و دێ ئاریشەیێن تەندرۆستی ل دویڤ خۆ هێلیت.



### رێژەیێن ئاسایی یێن خرۆکێن سۆرێن خوینێ:

| تەمەن | رەگەز | رێژەیێن ئاسایی | یەکە |
|---|---|---|---|
| نێر (پێگەهشتی) | | 4.7 – 6.1 | million cells per microliter |
| مێ (پێگەهشتی) | | 4.2 – 5.4 | million cells per microliter |

ئەڤێن ل خوارێ دیارکری پەیوەندییەکا ڕاستەوخۆ یا ل گەل خرۆکێن سۆر هەی، ب ڕێکا وان د شیاندایە چەندین نەخۆشی بهێنە دەستنیشانکرن ژ وان سالاسیمیا، کێم خوینی، کێمیا مادەیێ ئاسنی، ...هتد.

( MCV,MCH,MCHC,RDW )

هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا خرۆکێن سۆرێن خوینێ:

1. نەخۆشییێن گرێدایی گولچیسکان.
2. جگارە کێشان.
3. ڤەخوارنا کحۆلێ.
4. نەخۆشییێن گرێدایی جگەرێ.
5. هندەك ژ جۆرێن پەنجەشێرێ.
6. ب کێمبوونا شلەیێن لەشی خرۆکێن سۆرێن خوینێ دێ زێدە بن.

هۆکارێن دبنە ئەگەرێ کێمبوونا ڕێژەیا خرۆکێن سۆرێن خوینێ:

1. هەبوونا ئاریشەیان د مەژییێ سۆرێ هەستیدا.
2. سالاسیمیا.
3. کێمیا ڤیتامین B12
4. خوینبەربوون.
5. پەنجەشێرا قۆلۆنێ.



## خرۆکێن سپییێن خوینێ White Blood Cell (WBC)

خرۆکێن سپییێن خوینێ ب هێلا دەستپێکێ یا بەرگرییا لەشی دهێنە هژمارتن ل دژی تووشبوون ب هەر میکرۆبەکی (بەکتریا، ڤایرۆس، کەروو، ...هتد). ل دەمێ هاتنا هەر میکرۆبەکی ژ بۆ ناڤا لەشی خرۆکێن سپییێن خوینێ هێرشێ دکەنە سەر و ژناڤ دبەن، ژ بەرهندێ ل دەمێ هەبوونا هەوکرنان بلەز ڕێژەیا خرۆکێن سپییێن خوینێ بلند دبن د ناڤ خوینێدا، خرۆکێن سپییێن خوینێ ناڤك یا هەی، بەلێ هیمۆگلۆبین تێدا نینە.

**خرۆکێن سپییێن خوینێ ژ دوو بەشێن سەرەکی پێکدهێن:**

1. Granolocyte (Basophil , Eosinophil , Neutrophil)
2. Agranulocyte (Monocyte , Lymphocyte)

**ڕێژەیا ئاسایی یا خرۆکێن سپییێن خوینێ:**

- 4000 - 11000 Cell/mm3



(a) (b) (c) (d) (e)

**هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا رێژەیا خرۆکێن سپییێن خوینێ:**

1. پەنجەشێر.
2. هەوکرن.
3. زیان بەرکەڤتن ب شانەیێن لەشی.
4. سۆتن.
5. نشتەگەری.

**هۆکارێن دبنە ئەگەرێ کێمبوونا رێژەیا خرۆکێن سپییێن خوینێ:**

1. مەلاریا.
2. نەخۆشییا ئایدز.
3. وەرگرتنا چارەسەرییێن کیمیایی.
4. نەخۆشییا کرۆنس (نەخۆشییەکا گرێدایی سیستەمێ کۆئەندامێ هەرسکرنێیە).
5. کێمییا خوینێ ژ جۆرێ Aplastic Anemia

WHITE BLOOD CELLS

Lymphocyte



Basophil



Neutrophil



Eosinophil



Monocyte



## پەرکێن خوینێ Platlets

پەرکێن خوینێ د گرنگن ژ بۆ مەیاندنا خوینێ، بچویکترین جۆرێ خانەیێن خوینێ دهێنە هژمارتن، بێ ناڤکن، پەرکێن خوینێ د ناڤ مەژیێ سۆرێ هەستیدا دروست دبن، پاشی دچنە د ناڤ زڤرۆکا خوینێدا، ل دەمێ خوینبەربوونێ پەرکێن خوینێ پێکڤە دمینن ژ بۆ هندێ خوینبەربوونێ رابوەستینن، ئەگەر ژمارەیا پەرکێن خوینێ کێم بن شیانێن کونترۆلکرن و خوینمەیینێ دێ کێم بن ل دەمێ هەبوونا بارودۆخێن خوینبەربوونێ، هەروەسا ئەگەر رێژەیا پەرکێن خوینێ بلند بیت دێ بیتە ئەگەرێ هندێ خوین بمەییت د لوولەیێن خوینێدا و دێ بیتە ئەگەرێ هەبوونا ئاریشەیێن تەندرۆستی یێن جۆراوجۆر و مەترسیدار.

رێژەیا ئاسایی یا پەرکێن خوینێ:

- 150000 - 450000 microliter



هۆكارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا پەركێن خوینێ:

1. كێمبوونا خوینێ ژ ئەگەرێ كێمیا مادەیێ ئاسنی.
2. نشتەگەری.
3. هەوكرنێن دۆمدرێژ.
4. كێمبوونا مادەیێ ئاسنی.
5. پەنجەشێر.
6. خوینبەربوون.
7. Polycythemia Vera ل دەمێ مەژییێ هەستی ڕێژەیەكا زۆر ژ خرۆكێن سۆرێن خوینێ دروست دكەت زێدەتر ژ یا لەش پێدڤی.

هۆكارێن دبنە ئەگەرێ كێمبوونا ڕێژەیا پەركێن خوینێ:

1. نەخۆشییا ئایدزێ.
2. نەخۆشییێن جگەرێ یێن دۆمدرێژ.
3. گەلەك بكارهینانا كحۆلێ.
4. كێمیا خوینێ ژ جۆرێ Aplastic Anemia
5. كێمیا ڤیتامین B12
6. كێمیا ڤیتامین B9
7. هەوكرنێن ڤایرۆسی وەكی HIV, Epstein-Barr, chickenpox

نیشانێن بلندبوونا ڕێژەیا پەركێن خوینێ:

1. سەرئێشان.
2. سینگئێشان.
3. گێژبوون.
4. هەستكرن ب لاوازبوون و ماندیبوونێ.

نیشانێن كێمبوونا ڕێژەیا پەركێن خوینێ:

1. خوینبەربوونا دفنێ.
2. خوینبەربوون و درەنگ ڕاوەستیانا خوینبەربوونێ ل دەمێ هەر برینداربوونەكێ.
3. هەبوونا خوینێ د ناڤ میز و پیساتییێدا.
4. هەستكرن ب لاوازبوون و ماندیبوونێ.

## پشکنینا جۆرێ خوینێ Blood Group Test

هەر کەسەکێ جۆرەکێ خوینێ یێ هەی، چار جۆرێن سەرەکی یێن خوینێ یێن هەین، چ پەیوەندی ب ڕەگەز و ئایین و ڕەنگێ پیستێ لەشێڤە نینە، جۆرێن خوینێ د بچویك و مەزن، ژن و زەلامان و درێژ و کورتەبالاندا وەکی ئێکە، چار جۆرێن خوینێ یێن هەین ( A ,B , AB , O)، ژ بۆ دیارکرنا جۆرێ خوینا هەر کەسەکێ نموونەیەك ژ خوینا وی دێ هێتە پشکنینکرن ژ بۆ دیتنا مادەیەکێ تایبەت دبێژنێ Antigen ل سەر ڕوییێ خانەیێن سۆر یێ هەی و مادەیەکێ دی دبێژنێ دژەتەن Antibody د ناڤ پلازمایا خوینێدا.

ئەگەر خوینەکا نەگونجایی بۆ کەسەکێ بهێتە ڤەگوهاستن، دژەتەنێن د ناڤ پلازمایا ئەوی کەسیدا دێ هێرش کەنە سەر تەنێن نەبەرنیاس یێن خانەیێن سۆر و تێکشکینیت و ئەو کەسە دێ مەترسییا مرنێ ل سەر پەیدا بیت.




BLOOD GROUP AND BLOOD GROUPING

### فاکتەرێ ڕیس Rh Factor:

مادەیەکە ب ڕێکا بۆماوەیی ل سەر ڕوییێ خانەیێن سۆر پەیدا دبیت، ئەو کەسێن ئەڤ مادەیە هەی دبێژنێ ڕیس پۆزەتیڤ و هەروەسا ئەو کەسێن ئەڤ مادەیە نەبیت دبێژنێ ڕیس نێگەتیڤ. هەر چەندە چار جۆرێن سەرەکی یێن گروپێن خوینێ یێن هەین، بەلێ هەر ئێك ژ وان گروپان دابەش دبیت ژ بۆ دوو بەشان ئەو ژی پۆزەتیڤ یان نێگەتیڤ بۆ نموونە +A یان -A ، پشکنین ژ بۆ فاکتەرێ ڕیس یێ گرنگە ب تایبەت ژ بۆ ژنێن

دووگیان ل دەمێ ڤەگوهاستنا خوینێ. چێنابیت ڕیس پۆزەتیڤ بهێتە دان ب کەسەکێ کو هەلگرێ ڕیس نێگەتیڤ بیت، بەلێ بەروڤاژی دروستە.

ئەگەر هەردوو دایك و باب فاکتەرێ وان یێ ڕیس وەکی ئێك بن چ ئاریشە نینن، ئانکو هەردوو پۆزەتیڤ یان نێگەتیڤ بن، بەلێ ئەگەر باب پۆزەتیڤ بیت و دایك هەلگرا ڕیس نێگەتیڤ بیت ب مەترسی دهێتە هژمارتن، چونکی زارۆکێ دایکێ ب ئەگەرەکێ زۆر فاکتەرێ ڕیس دێ ژ بابی وەرگریت و پۆزەتیڤ بیت، ل دەمێ خوینا زارۆکی دگەهیتە خوینا ئەوێ دایکێ دێ بیتە ئەگەرێ دروستبوونا دژەتەنان و ئەو دژەتەنە دێ چنە د ناڤ خوینا ئەوی زارۆکیدا و دێ خانەیێن سۆر تێکشکینن، د ڤی بارودۆخیدا پشتی ژدایکبوونێ زارۆک دێ تووشی کێم خوینییەکا دژوار بیت و دێ تووشی گەلەك ئاریشەیان بیت، ڕێژەیا مرنێ د ڤان زارۆکاندا دگەهیتە نێزیکی 50% و ئەڤێن دی ژی دویر نینە تووشی تێکچوون و ئاریشەیێن گرێدایی مێشکی بن، لێ پشتی بەرەڤ پێشچوونا زانستێ پزیشکی ل دەستپێکێ پشکنین ژ بۆ هەردوو هەڤژینان دهێنە کرن و ئەگەر زەلام پۆزەتیڤ بوو و ژن نێگەتیڤ بوو ل بەری ژدایکبوونا زارۆکی دژەتەنێن تایبەتێن ئامادەکری پێ دهێنە دان و ئەو زارۆکێن تووشی تێکشکاندنا خرۆکێن سۆرێن خوینێ دبن پتریا جاران خوینا وان دگوهۆڕن.



**کەنگی و ل چ دەم پشکنینا جۆرێ خوینێ پێدڤییە بهێتە ئەنجامدان؟**

1. ل دەمێ دووگیانبوونێ.
2. بەری ئەنجامدانا هەمی جۆرێن نشتەگەرییان.
3. ل دەمێ ڤەگوهاستنا خوینێ ژ کەسەکێ بو کەسەکێ دی.
4. ل دەمێ ڤەگوهاســتنا پارچەیەك ژ ئەندامێ کەســەکێ بو کەســەکێ دی بۆ نموونە نشتەگەرییا چاندنا گولچیسك یان جگەرێ و دلی ...هتد.

HOW TO READ YOUR RESULTS

BLOOD TYPE — ANTI-A — ANTI-B — ANTI-D — CONTROL

O-POSITIVE
O-NEGATIVE
A-POSITIVE
A-NEGATIVE
B-POSITIVE
B-NEGATIVE
AB-POSITIVE
AB-NEGATIVE
INVALID

**پشکنینا جۆرێ خوینێ ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:**

- Blood Group Test
- Bl.Group Test
- Blood Group
- B.G Test
- Bl.G Test

## پشکنینا ڕێژەیا نیشتنا خرۆکێن سۆر ESR Test

پشـکنینا (ESR) Erythrocyte Sedimentation Rate ڕێژەیا نیشـتنا خرۆکێن سـۆرێن خوینێیە د ئێک دەمژمێردا، پشـــکنینا ESR دهێتە بکارهینان و مفا ژێ دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دیارکرنا هەبوون یان نەبوونا هەوکرنان د ناڤ لەشـیدا و هەروەسـا ڕێژەیا هەوکرنێ ددەتە دیارکرن، بەلێ بێی دیارکرنا ئەگەرێ هەوکرنێ و دەستنیشانکرنا جهێ هەوکرنێ ئانکو ب تنێ دیار دکەت ب شێوەیەکێ گشتی ئەرێ هەوکرن د لەشیدا هەیە یان ژی نینە.

پتریبا خەلکێ و ب مخابنیڤە هندەك ژ کارمەندێن تاقیگەهێ هزر دکەن بلندبوونا ڕێژەیا پشـکنینا ESR د کەسەکێدا ئانکو نەخۆشییا ڕۆماتیزمێ یا ل دەڤ پەیدا بووی، ئەڤ شێوازێ هزرکرنێ گەلەك یێ شـاشە، ژ بەر کو پشکنینا ڕێژەیا نیشتنا خرۆکێن سۆر نە تایبەتمەندە ب نەخۆشـییا ڕۆماتیزمێڤە د گەلەک کاودان و ڕەوشاندا ڕێژەیا وێ بلند دبیت، مەرج نینە هەر هەوکرنەك د لەشیدا پەیدا ببیت ئاماژە بیت ژ بۆ نەخۆشییا ڕۆماتیزمێ.




ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا ESR:

ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:

| یەکە | ڕێژەیێن ئاسایی | تەمەن |
|---|---|---|
| mm/hr | کێمتر بیت ژ 10> | 17 هەتا 50 سالییێ |
| mm/hr | کێمتر بیت ژ 12> | 50 هەتا 70 سالییێ |
| mm/hr | نێزیکی 30 | 70 سالییێ و زێدەتر |

ل دەڤ ڕەگەزێ مێ :

| یەکە | ڕێژەیێن ئاسایی | تەمەن |
|---|---|---|
| mm/hr | کێمتر بیت ژ 12> | 17 هەتا 50 سالییێ |
| mm/hr | کێمتر بیت ژ 14> | 50 هەتا 70 سالییێ |
| mm/hr | نێزیکی 35 | 70 سالییێ و زێدەتر |

ل دەڤ زارۆکان:

| یەکە | ڕێژەیێن ئاسایی | بارودۆخ |
|---|---|---|
| mm/hr | 0 -2 | زارۆکێن ژ نوی ژدایکبووی |
| mm/hr | 3 - 10 | زارۆکێن ساڤا هەتا ژییێ پێگەهشتنێ |



## هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا نیشتنا خرۆکێن سۆرێن خوینێ ESR:

1. دووگیانی.
2. پەنجەشێر.
3. کێم خوینی.
4. هەبوونا فایبرۆنووجینی، گلۆبیۆلین، بلندبوونا کلۆسترۆلی د ناڤ خوینێدا.
5. زڤرۆکا هەیڤانە ل دەڤ ژنان.
6. بلندبوونا تەمەنی.
7. هەبوونا هەوکرنان د ناڤ لەشیدا.
8. نەخۆشییێن گرێدایی گولچیسکان.
9. نەخۆشییێن گرێدایی ڕژێنا پەریزادە(الغدة الدرقية).

**تێبینی:**

- د ژنەکا ب تەمەندا ژییێ وێ د ناڤبەرا 70 هاتا 90 سالیدا ڕێژەیا ESR دێ بلندبیت.

## هۆکارێن دبنە ئەگەرێ کێمبوونا ڕێژەیا نیشتنا خرۆکێن سۆرێن خوینێ ESR:

1. بلندبوونا ڕێژەیا گلووکۆزی.
2. بلندبوونا ڕێژەیا ئەلبۆمینی.
3. بلندبوونا ڕێژەیا خرۆکێن سۆرێن خوینێ ب شێوەیەکێ نەئاسایی.
4. بلندبوونا ڕێژەیا خرۆکێن سپییێن خوینێ.
5. کێمبوونا ڕێژەیا فایبرۆنووجینی د ناڤ خوینێدا د زارۆکێن ژ نوی ژدایکبوویدا.
6. هندەك ژ جۆرێن دەرمانان وەکی Steroid

## پشکنینا ڕێژەیا نیشتنا خرۆکێن سۆر ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- ESR Test
- ESR
- ESR 1h. Test
- Erythrocyte Sedimentation Rate Test
- Erythrocyte Sedimentation Rate

## پشکنینا دەمێ خوینبەربوونێ Bleeding Time (BT) Test

مفا ژ پشکنینا BT دهێتە وەرگرتن ژ بۆ زانینا دەمێ خوینبەربوونێ ل دەمێ برینداربوون یان نشـــتەگەرییێ یان ب هەر ئەگەرەکێ هەبیت ببیتە ئەگەرێ خوینبەربوونێ، پشـــکنینا دەمێ خوینبەربوونێ پشـت ب ژمارەیا پەرکێن خوینێ Platlets دبەستیت ژ بۆ ڕاوەستاندنا خوینبەربوونێ، پەرکێن خوینێ ژ خـانەیێن خوینێ دهێنە هژمـارتن ل دەمێ هەبوونـا هەر برینەکێ د نـاڤ لەشــیـدا پەرکێن خوینێ ئێکەم خـانەیە دگەهیتە جهێ برینێ و ڕادبن ب ڕاوەســتاندنا خوینبەربوونێ و ڕێگریکرن لێ، ئەڤ پشـــکنینە پتر ژ بۆ وان کەســـان دهێتە ئەنجامدان یێن پێدڤی نشتەگەرییانن ژ بۆ زانینا دەمێ خوینبەربوونێ.

**ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا دەمێ خوینبەربوونێ:**

- 2 هەتا 6 خۆلەکان.



**پشکنینا دەمێ خوینبەربوونێ ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:**

- B.Time Test
- Bleeding Time Test
- Bleeding Time
- BT
- BT.Test

## پشکنینا دەمێ خوینمەیینێ Clotting Time (CT) Test

مفا ژ پشکنینا CT دهێتە وەرگرتن ژ بۆ زانینا دەمێ مەیاندنا خوینێ ل دەمێ بریندداربوون یان نشتەگەرییێ یان ب هەر ئەگەرەکێ هەبیت ببیتە ئەگەرێ خوینبەربوونێ، ئەڤ پشکنینە پتر ژ بۆ وان کەسان دهێتە ئەنجامدان یێن پێدڤی نشتەگەرییانن ژ بۆ زانینا دەمێ مەیینا خوینێ.

ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا دەمێ خوینمەیینێ:

- 2 هەتا 10 خۆلەکان.




کەنگی پێدڤییە پشکنینا دەمێ خوینمەیینێ Clotting Time بهێتە ئەنجامدان؟

1. بەری ئەنجامدانا نشتەگەرییێ.
2. دەمێ خوینبەربوون ب کۆتەکی یان درەنگ ڕاوستیت.
3. ژ بۆ ئەوان کەسێن ئاریشەیێن خوینمەیینێ هەین.
4. ئەو کەسێن دەرمانێن گرێدایی مەیاندنا خوینێ بکاردهینن.
5. ژ بۆ زانینا کارتێکرنا دەرمانان.

پشکنینا دەمێ خوینمەیینێ ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- C.Time Test
- Clotting Time Test
- CT

## پشکنینا پرۆتینێ D.Dimer

D.Dimer پارچە پرۆتینەکە دروست دبیت ل دەمێ خوینا مەیی (Clott) تێکدشکێت و شــی دبیت د ناڤ لەشــیدا، پرۆتینێ D.Dimer د بارودۆخێن ئاســاییدا هەبوون د ناڤ لەشــیدا نینە یان ب ڕێژەیەکا گەلەك کێم یا هەی، ڕێژەیا پشــکنینا D.Dimer بلند دبیت ل دەمێ خوینا مەیی تێکدشــکێت یان دحەلییێت، ئانکو ژ ئەگەرێ خوینمەیینێ و تێکشــکاندنا خوینا مەیی ڕێژەیا پرۆتینێ D.Dimer د ناڤ خوینێدا بلند دبیت، پشت ب ئەنجامێ ئەڤێ پشکنینێ دهێتە بەستن ژ بۆ دەستنیشانکرنا چەندین ئاریشەیێن تەندرۆستی.

ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا پرۆتینێ D.Dimer:

- بلندتر ژ 500 mg/dl < ئانکو پۆزەتیڤ.
- کێمتر ژ 500 mg/dl > ئانکو نێگەتیڤ.



چاوانییا دروستبوونا پرۆتینێ D.Dimer:

ل دەمێ شــانەیێن لەشــی زیان پێ دکەڤیت و خوینبەربوون پەیدا دبیت پرۆســەیەك دەستپێدکەت دبێژنێ Hemostasis پەرکێن خوینێ ل گەل Fibirn ی بەرەڤ جهێ برین لێ پەیـدابووی دچن و خوینمەیینێ دروســت دکەن و خوینبەربوونێ ڕادوەســتینن، پشــتی چێبوون و چاکبوونا جهێ برینێ لەش دێ ئەنزیمێ Plasmin بکارهینیت ژ بۆ تێکشــکاندنێ و خوینـا مەیی و ئەو پـارچەیێن ژ خوینـا مەیی دحەلیێن دبێژنێ Fibrin Degradation Products ژ پـارچەیێن جیـاوازێن Fibirn ی پێکدهێن و ئێك ژ وان پارچەیێن Fibirn دێ

مـادەیێ D.Dimer ژێ هێتە بەرهەمهینـان ئـانکو ل دەمێ Fibirn د نـاڤ خوینـا مەییـدا دحەلییت و تێکدشکێت ڕێژەیا پروتینێ D.Dimer ب شێوەیەکێ بەرچاڤ بلند دبیت.

## بۆچی پشکنینا پرۆتینێ D.Dimer دهێتە ئەنجامدان؟

ئەڤ پشـکنینە هاریکارە ژ بۆ دەسـتنیشـانکرنا خوینمەیینا نەئاسـایی د ناڤ لەشـیدا ژ بۆ دەستنیشانکرنا:

1. Deep Vien Thrombosis - DVT ل دەمێ هەبوونا خوینا مەیی د ناڤ دەمارێن کیرێن لەشیدا.
2. Pulmonary Embolism - PE ل دەمێ هەبوونا خوینا مەیی ل ناڤ وان دەمارێن خوینێ ژ بۆ سیهان دبەن.
3. ل دەمێ هەبوونا (جەلتەیێ) Stroke
4. Disseminated Intravascular Cogulation - DIC ل دەمێ هەبوونا خوینا مەیی ل ناڤ وان موولوولەیێن بچویکێن خوینێ ژ بۆ لەشی ڤەدگوهێزن.
5. ژ بۆ چاڤدێریکرنا کارتێکرنا دەرمانێن ژ بۆ چارەسەرییێ دهێنە بکارهینان.



نیشانێن Deep Vien Thrombosis - DVT

ل دەمێ هەبوونا خوینا مەیی د ناڤ دەمارێن کیرێن لەشیدا:

1. وەرمتنا پێیان.
2. ئێشانا پێیی پتریا جاران د ئێك پێییدا ڕویددەت.
3. تێکچوونا ڕەنگێ سرۆشتییێ پێیی.

نیشانێن Pulmonary Embolism - PE

ل دەمێ هەبوونا خوینا مەیی ل ناڤ وان دەمارێن خوینێ ژ بۆ سیهان دبەن:

1. خوهدان.
2. کوخك، هندەك جاران هەبوونا خوینێ ل گەل بلغەمی.
3. بلەز لێدانا لێدانێن دلی.
4. هەبوونا ئاستەنگان ل دەمێ هەناسەدانێ.
5. سینگئێشان.

نیشانێن Disseminated Intravascular Cogulation - DIC

ل دەمێ هەبوونا خوینا مەیی د ناڤ وان موولوولەیێن بچویکێن خوینێ ژ بۆ لەشی ڤەدگوهێزن:

1. ئێشانا ماسۆلکەیان.
2. کێم میزکرن.
3. هەلاڤێتن.
4. خوینبەربوونا دفنێ.

### هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا پڕۆتینێ D.Dimer د ناڤ لەشیدا:

هەر بلندبوونەك د ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا D.Dimer دا پەیدا دبیت مەرج نینە ڕامانا هندێ بیت خوینا مەیی هەبوون یا د ناڤ لەشیدا هەی، هندەك ژ هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونێ:

1. پەنجەشێر.
2. هەوکرن.
3. جەلتەیا دلی.
4. نەخۆشییێن گرێدایی گولچیسکان.

ڕامانا ئەنجامێن پشکنینا پڕۆتینێ D.Dimer چ دگەهینیت:

- ئەگەر ئەنجام بلندتر بوو ژ ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئانکو ڕێژەکا زۆر ژ Fibrin ێ تێکشکاندی هەبوونا هەی د ناڤ خوینا نەخۆشیدا.

- ئەگەر ئەنجام نێگەتیڤ بوو ئانکو نەخۆشی چ خوینمەیینەکا نەئاسایی یا ببیتە ئەگەرێ دروستبوونا پڕۆتینێ D.Dimer د ناڤ لەشیدا نینە.



### پشکنینا پڕۆتینێ D.Dimer ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- D.Dimer Test
- Fibrin Degration Fragment Test

## پشکنینا تێکڕایا دەمێ تەرخانکری بۆ مەیینا خوینێ - PT Test
## Prothrombin Time Test

پشـــکنینا PT دهێتە بکارهینان ژ بۆ دەســتنیشــانکرنا تێکڕایا دەمێ تەرخانکری بۆ مەیینا خوینێ، ڕێژە ب چرکەیان دەردکەڤیت، پشـــکنینا PT ل گەل پشـــکنینا PTT پێکڤە دهێنە ئەنجامـدان ژ بۆ ڕۆنکرنـا فـاکتەرێن مەیـانـدنێ Cogulation Factor و کریـارا مەیاندنێ، Prothrombin بریتییە ژ Factor II ئێـك ژ وان پڕوتینایە یێن د کریارا مەیاندنێدا دهێتە بکارهینان.

### International Normalised Ratio (INR) Test

INR هژمارکرنەکا تاقیگەهییە پشــت ب بڕا PT دبەســتیت، مفا ژێ دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دیارکرنا کارتێکرنا دەرمانێن دژی مەیاندنێ یێن ژلایێ نەخۆشیڤە دهێنە بکارهینان.

ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا INR و PT:

- PT : 11 - 16 seconds
- INR : 0.96 - 1.36



## کەنگی پێدڤییە پشکنینا INR و PT بهێنە ئەنجامدان؟

1. ل دەمێ بکارهینانا دەرمانێن دژی مەیاندنێ.
2. ل دەمێ پەیدابوونا خوینبەربوونێ بێی چ ئەگەرەکێ دیارکری.
3. ل دەمێ هەبوونا خوینێ د ناڤ میزێ یان پیساتییێدا.
4. ل دەمێ دیتنا خوینەکا زۆر ژ لایێ ژنانڤە د زڤڕۆکا هەیڤانەدا.
5. ل دەمێ دووبارەبوونا خوینبەربوونا دفنێ بێی چ زەبر.
6. ژ بەری کرنا نشتەگەرییێ ژ بۆ زانینا دەمێ خوینمەیینێ.

### هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا INR , PT :

1. هەبوونا ئاریشەیان د ئێك ژ فاکتەرێن خوینمەیینێدا Coagulation Factor
2. نەخۆشیێن گرێدایی جگەرێ.
3. کێمییا Vitamin K ، ڤیتامین K ڕۆلەکێ گرنگ یێ د کریارا خوینمەیینێدا هەی.
4. بکارهینانا زێدەتر ژ یا پێدڤی ژ دەرمانێن دژی مەیاندنێ وەکی Warfarin
5. هندەك ژ جۆرێن دەرمانان وەکی Antibiotic

### هۆکارێن دبنە ئەگەرێ کێمبوونا ڕێژەیا INR , PT :

1. ڤەخوارنێن کحۆلی.
2. دبیت دەرمانێن ئازارشکێن(مسکن) و دەرمانێن دژی دووگیانبوونێ کارتێکرنێ ل ڕێژەیا INR , PT بکەن.

### پشکنینا INR , PT ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- PT - INR Test
- Prothrombin Time Test
- International Normalised Ratio Test
- INR Test
- INR
- PT

## پشکنینا شیان و دەمێ هژمارکرییێ خوینمەیینێ PTT Test
## Partial Thromboplastin Time Test

پشکنینا PTT ژ بۆ مە شیان و دەمێ هژمارکرییێ خوینمەیینێ شرۆڤە دکەت، ل دەمێ هەر خوینبەربوون یان برینداربوونەکێ سیستەمێ مەیاندنێ ڕاستەوخۆ دێ چالاك بیت، ڕێژەیا PTT هندەك جاران گوهۆڕین ب سەردا دهێن ژ ئەگەرێ دژەتەنان یێن لەش دروست دکەت ل دژی چەند پێکهاتەیان وەکی Antiphospholipid و Lupus Anticoagulant، کێمبوون یان دروست کارنەکرنا هەر ئێك ژ فاکتەرێن خوین مەیاندنێ پەیوەندییەکا ڕاستەوانە یا هەی ل گەل نەئاساییبوونا ئەنجامێ پشکنینا شیان و دەمێ هژمارکرییێ خوینمەیینێ (PTT).

**تێبینی:**

- پشکنینا PTT ژ بۆ نەخۆشییەکا دەستنیشانکری ناهێتە ئەنجامدان، پترییا جاران ل گەل پشکنینا Prothrombin Time (PT) پێکڤە دهێنە ئەنجامدان.

**ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا PTT:**

- کێمتر بیت ژ: 35 Seconds>



## کەنگی پێدڤییە پشکنینا PTT بهێتە ئەنجامدان؟

1. ل دەمێ دووبارەبوونا ژبەرچوونا زارۆکان ل دەڤ ژنان.
2. ل دەمێ هەبوونا مەیینا خوینێ د ناڤ لەشیدا.
3. ل دەمێ بکارهینانا دەرمانێن دژی مەیاندنێ ژ بۆ زانینا کارتێکرنا دەرمانان ل سەر نەخۆشی.
4. ل دەمێ هەبوونا ئاریشەیان د سیستەمێ مەیاندنا خوینێدا.
5. ژ بەری ئەنجامدانا نشتەگەرییێ ژ بۆ زانینا شیان و دەمێ هژمارکرییێ خوینمەیینێ.

### هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا رێژەیا PTT:

1. کێمییا Vitamin K ، ڤیتامین K رۆلەکێ گرنگ یێ د کریارا خوینمەیینێدا هەی.
2. نەخۆشییێن گرێدایی جگەرێ.
3. هەبوونا ئاریشەیان د سیستەمێ بەرگرییێدا.
4. کێمییا فاکتەرێن مەیاندنێ Coagulation Factor
5. نەخۆشییا Von Willebrand Disease
6. بارودۆخێ Hemophilia

### هۆکارێن دبنە ئەگەرێ کێمبوونا رێژەیا PTT:

1. هندەك ژ جۆرێن پەنجەشێرێ وەك: پەنجەشێرا پەنکریاس و هێلکەدانێ و ...هتد.
2. Disseminated Intravascular Cogulation - DIC ل دەمێ هەبوونا خوینا مەیی ل ناڤ وان موولوولەیێن بچویکێن خوینێ ژ بۆ لەشی ڤەدگوهێزن.



**هندەك ژوان دەرمانێن ڕاستەوخۆ كارتێكرن هەی ل سەر نەئاساییبوونا ڕێژەیا PTT:**

- Heparin
- Warfarin
- Aspirin
- Antihistamines
- Vitamin C
- Chlorpromazine

**پشكنینێن پەیوەندیدار ب پشكنینا PTT ڤە:**

1. Prothrombin Time (PT) Test
2. Fibrinogen Test
3. Clotting Time (CT) Test
4. Complete Blood Count (CBC) Test
5. Antiphospholipid Antibody (IgG , IgM)
6. Lupus Anticoagulant Test
7. Von Willebrand Factor

**پشكنینا PTT ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:**

- Partial Thromboplastin Time Test
- PTT
- PTT Test
- Activated Partial Thromboplastin Time Test
- APTT Test
- APTT

## پشکنینا کۆمبس Coombs Test

مفا ژ پشکنینا Coombs دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا رێژەیا دژەتەنێن دناڤ خوینێدا یێن هێرشی خرۆکێن سۆرێن خوینێ دکەن. دژەتەن چنە؟ دهێنە هژمارتن بەشەک ژ سیستەمێ بەرگرییا لەشی. هێرشی میکرۆبان (کەڕوو، بەکتریا، ڤایرۆس) دکەن، بەلێ هندەک جاران بەرهنگاری خانەیێن تەندرۆستێن لەشی دبیت و ئاریشەیێن مەزنێن تەندرۆستی ل دویڤ خۆ دهێلیتن.

دوو جور ژ پشکنینا Coombs یێن هەین:

1. Direct Coombs
2. Indirect Coombs



## بۆچی پشکنینا Direct Coombs دهێتە ئەنجامدان؟

پشکنینا Direct Coombs یان DAT دهێتە ئەنجامدان ل دەمێ هەستکرن ب نەئارامبوونێ یان ل دەمێ هەبوونا نیشانێن ئاریشەیێن گرێدایی خوینێ. دێ تووشی ئاریشەیان بی پشتی وەرگرتنا خوینەکا نەگونجایی دگەل جورێ خوینا خۆ، ل ڤی دەمی لەش دێ هندەک پێکهاتەیان دروست کەت وەک بەرسڤدانەکا لەشی ژ بۆ ئەوێ خوینا نەگونجایی یا هاتییە وەرگرتن. Autoimmune Hemolytic Anemia نەخۆشییەکا خوینێیە پەیدادبیت ل دەمێ دژەتەن هێرشی خرۆکێن سۆرێن خوینێ دکەن و تێکدچن ب لەزتر ژ خرۆکێن سورێن خوینێ یێن لەش ژنوی دروست دکەت. دبیت تووشببی ژ ئەگەرێ....

1. نەخۆشییان وەکی پەنجەشێرا خوینێ Leukemia یان دژەتەنێن Lupus
2. هەوکرن وەکی Mononucleosis و ...هتد.
3. ب کارهینانا هندەک دەرمانان وەکی Penicillin



## بۆچی پشکنینا InDirect Coombs دهێتە ئەنجامدان؟

پشکنینا InDirect Coombs پتریا جاران دهێتە داخوازکرن ژ لایێ نۆژدارێن تایبەتمەندڤە ژ بۆ ئافرەتێن دووگیان ژ بەری ژ دایکبوونێ، ژ بۆ پشکنینکرنا دەیکا دووگیان ژ بۆ زانین و دەستنیشانکرنا دژەتەنان ئەگەر هەبن ژ بۆ هندێ ژ بۆ زارۆکی نەهێنە ڤەگوهاستن و ئاریشێن ترسناکێن تەندرۆستی ل دویڤ خۆ بهێلیتن. پتریا جاران ڕاستەوخۆ پشکنین دهێتە ئەنجامدان ل دەمێ هەبوونا گومانان دەربارەی کێم خوینییێ ژ ئەگەرێ شکاندنا خڕۆکێن سۆرێن خوینێ ژ لایێ دژەتەنانڤە، دژەتەن چنە؟ دهێنە هژمارتن وەکو پرۆتین، سیستەمێ بەرگریا لەشێ هەر کەسەکێ ساخلەم بەرهەمدهینیت ل دەمێ هەبوونا هندەک ژ مادە یان تشتەکێ نەناسیار دناڤ لەشیدا.

ل دەمێ هەبوونا ئەڤان نیشانان باشترە پشکنینا InDirect Coombs بهێتە ئەنجامدان:

1. هەستکرن ب لاوازبوون و نەمانا هێزێ.
2. تەزیبوونا دەست و پێیان.
3. گوهورینا ڕەنگێ پیستێ لەشی.
4. کێمبوونا خڕۆکێن سۆرێن خوینێ.
5. تەنگەنەفەسی.

هندەک ژ بارودۆخێن دبنە ئەگەرێ هەبوونا دژەتەنان ل سەر خڕۆکێن سۆرێن خوینێ:

1. ل دەمێ سیستەمێ بەرگریا لەشی هێرشی خڕۆکێن سۆرێن خوینێ دکەت و وەکو تەنەکێ نەنیاس هەژماردکەت.
2. وەک کارڤەدانەک ل دەمێ ڤەگوهاستنا خوینێ ل دەمێ سیستەمێ بەرگریا لەشی هێرش دکەتە ل سەر خوینا بەخشەری.
3. شێرپەنجا خوینێ یا لیمفاوی.
4. هەژمارا خڕۆکێن سپییێن خوینێ.
5. نەخۆشیا VDRL
6. تووشبوون ب بەکتریا مایکوپلازما.
7. ب کارهینانا هندەک ژ جورێن دەرمانان.

**ڕامانا ئەنجامێن پشکنینا Coombs:**

**- ئەنجامێ نێگەتیڤ یێ پشکنینێ ب ڕامانا ئاساییبوونا ئەنجامێ پشکنینێ دهێتە هژمارتن.**

**- نەئاساییبوونا ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ (پۆزەتیڤ) یا پشکنینا Direct Coombs ب ڕامانا هەبوونا دژەتەنان یێن هێرشی خڕۆکێن سۆرێن خوینێ دکەن هەنە دناڤا لەشیدا. دبیت ژ ئەگەرێ....**

1. **Autoimmune Hemolytic Anemia**
2. **نەخۆشیا پەنجەشێرا خوینێ یا دۆمدرێژ یان نەخۆشیێن ب ڤی جۆری.**
3. **نەخۆشیێن خوینێ ل دەڤ تازە ژدایکبوویان دهێنە نیاسین ب Erythroblastosis Fetalis هەروەسا دهێنە نیاسین ب (Hemolytic Disease of the Newborn).**
4. **Infectious Mononulceosis**
5. **تووشبوون ب هەوکرنا بەکتریا Mycoplasma**
6. **تووشبوون ب Syphilis ێ. هەوکرنەکا بەکتریایی یە، Syphilis ئێک ژ بەربەلاڤترین نەخۆشیێن ب ڕێکا سێکسی دهێنە ڤەگوهاستن دهێتە هژمارتن.**
7. **Systemic Lupus Erythematosu**

**تێبینی:**

- **دبیت ئەنجامێ پشکنینێ نەئاسایی دەربچیت بێی هەبوونا ئەگەرێن ل سەری هاتینە بەحسکرن، ب تایبەت ل دەڤ کەسێن ب تەمەن.**

- نەئاساییبوونا ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ (پۆزەتیڤ) یا پشکنینا Indirect Coombs ب ڕامانا هەبوونا دژەتەنانە یێن هێرشی خرۆکێن سۆرێن خوینێ دکەن وەک کەرەستەیەکێ نەئاسایی دناڤا لەشیدا. دبیت ژ ئەگەرێ....

1. نەخۆشییێن خوینێ ل دەڤ تازە ژدایکبوویان دهێنە نیاسین ب Erythroblastosis Fetalis هەروەسا دهێنە نیاسین ب (Hemolytic Disease of the Newborn).
2. نەگونجاندنا جورێن خوینێ دگەل ئێک(ل دەمێ ب کارهینانێ د بانکێن خوینێدا).

پشکنینێن Coombs ب ڤان شێوازان دهێنە نڤیسین:

- Direct Coombs Test
- Direct Coombs
- Indirect Coombs
- D-Coombs
- In-Coombs
- DAT
- Indirect Coombs Test
- Coombs both types
- Coombs test

Dep. Serology Tests

## پشکنینا هەوکرنان د ناڤ لەشیدا C-reactive protein (CRP) Test

مفا ژ پشکنینا CRP دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا رێژەیا پرۆتینێ C-reactive protein د ناڤ خوینێدا، پرۆتینێ CRP ژ لایێ جگەرێڤە دهێتە دەردان، پشکنینا پرۆتینێ CRP هاریکارە ژ بۆ دەستنیشانکرنا هەوکرنان د ناڤ لەشیدا بەلێ دەستنیشان ناکەت جهێ هەوکرن لێ پەیدابووی د ناڤ لەشیدا ئانکو ب تنێ وەکی پشکنینەکا هاریکار دهێتە بکارهینان و مفا ژێ دهێتە وەرگرتن و یا تایبەتمەند نینە ژ بۆ دەستنیشانکرنا چ ئاریشەیێن تەندرۆستی ب تنێ وەکی پشکنینەکا هاریکار پشت پێ دهێتە بەستن، د بارودۆخێن ئاساییدا رێژەیا پرۆتینێ CRP د ناڤ خوینێدا گەلەک یا کێمە، بەلێ ل دەمێ هەبوونا هەوکرنان دناڤ لەشیدا دبیتە ئەگەرێ هندێ رێژەیەکا زۆر برێژیتە د ناڤ زڤرۆکا خوینێدا، ل دەمێ بلندبوونا رێژەیا پرۆتینێ C-reactive protein د ناڤ خوینێدا ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا هەوکرنان د ناڤ لەشیدا.

رێژەیا ئاسایی یا پشکنینا پرۆتینێ CRP د ناڤ لەشیدا:

- کێمتر بیت ژ: <6.00 mg/L



**هندەك ژ نیشانێن هەبوونا هەوکرنان د ناڤ لەشیدا:**

1. تا.
2. لەزرین.
3. هەبوونا ئاریشەیان ل دەمێ هەناسەدانێ.
4. بلەز لێدانا لێدانێن دلی.
5. هەستکرن ب ماندیبوونێ.
6. گێژبوون.

**هندەك ژهۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا پرۆتینێ C-reactive protein د ناڤ لەشیدا:**

1. هەوکرن ب شێوەیەک گشتی.
2. جەلتەیا دلی.
3. نەخۆشییا پەنجەشێرێ.
4. هەوکرنێن دۆمدرێژ.
5. نەخۆشییێن گرێدایی سیستەمێ بەرگرییا لەشی.

**تێبینی:**

- هەر بلندبوونەك د ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێدا پەیدا ببیت مەرج نینە ژ ئەگەرێ نەخۆشییێن ل سەری هاتینە بەحسکرن بیت، هۆکارێن گەلەک بچویك هەنە دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا پشکنینا پرۆتینێ CRP وەکی جگارەکێشان، قەلەوی، کرنا ڕاهێنانێن بهێز، ...هتد.

**ڕامانا ئەنجامێن پشکنینا پرۆتینێ CRP:**

ئەگەر ئەنجامێ پشکنینێ بلندتر بوو ژ ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا هەوکرنان د ناڤ لەشیدا بەلێ ئەڤ پشکنینە دەستنیشان ناکەت ئەگەر و هۆکارێ هەوکرنێ د ناڤ لەشیدا، هەر ژ بەر هندێ نۆژدار دێ داخوازا هندەك پشکنینێن دیتر کەت ژ بۆ زانینا جهـ و ئەگەرێ هەوکرنێ د ناڤ لەشیدا، هەر بلندبوونەك د ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا

CRP دا پەیدا ببیت ئاماژە نینە ژ بۆ هەبوونا نەخۆشـــییەکا دەســـتنیشـــانکری و پێدڤی ب چـارەســـەرییێ ببیـت ژ بەر کو دبیـت هندەك هۆکارێن دیتر هەبن ببنە ئەگەرێ بلندبوونا رێژەیا ئەنجامێ پشـکنینێ د ناڤ لەشـیدا وەکی جگارەکێشان، قەلەوی، کرنا ڕاهێنانێن بهێز، ...هتد.

پشکنینا پرۆتینێ C-reactive protein ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- C-reactive protein Test
- CRP
- CRP Titer
- CRP Test
- HS-CRP
- C-reactive protein, serum Test
- C-reactive protein High Sensitive Test



A = CRP Test Positive B, C, D, F, G = CRP Test Negative

## پشکنینا دەستنیشانکرنا دژەتەنێ بەکتریا ASOT Test / Strep
## Antistreptolysin O Titer (ASOT) Test

پشکنینا Antistreptolysin O Titer ب ڕێکا خوینێ د شیاندایە بهێتە ئەنجامدان ژ بۆ پشکنینکرنا هەوکرنێن بەکتریا *Strep* ، ل دەمێ مرۆڤ تووشی هەوکرنا دبن ب ئەگەرێ بەکتریایێ لەشێ مرۆڤی دێ دەست ب بەرهەمهینانا دژەتەنان کەت ژ بۆ بەرهنگاربوونا بەکتریایێ، پشکنینا ASO titer ڕێژەیا دژەتەنێن لەش بەرهەم دهینیت ل دژی هەوکرنا بەکتریایی *Streptolysin O* دەستنیشان دکەت، *Streptolysin O* ب ژەهراوی دهێتە هژمارتن ژ بۆ لەشی و دهێتە هژمارتن ژ گرۆپێ A یێ *Streptococcus* بەکتریا، لەشێ مرۆڤی دێ دژەتەنێن *Antistreptolysin O* دروست کەت ل دەمێ هەبوونا هەوکرنا بەکتریا Strep ژ ئەگەرێ گرۆپێ A یێ *Streptococcus* بەکتریا، بلندبوونا ڕێژەیا پشکنینا ASO دبیت ببیتە ئەگەرێ هەوکرنێن لەوزەتێنی یان تا ڕۆماتیزمی.

ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا Antistreptolysin O Titer (ASO) د ناڤ لەشیدا:

- کێمتر بیت ژ: 200>
- ل دەڤ زارۆکێن کێمتر ژ تەمەنێ 5 سالییێ پێدڤییە کێمتر بیت ژ: 100>



**ڕامانا ئەنجامێن پشکنینا (Antistreptolysin O Titer (ASOT:**

- ب شێوەیەک گشتی ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینا ASO ئەگەر کێمتر بیت ژ 200 و ل دەڤ زارۆکێن کێمتر ژ تەمەنێ 5 سالییێ کێمتر بیت ژ 100 ب ئاسایی دهێتە هژمارتن، دبیت ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینێ ژ تاقیگەھەکێ بۆ تاقیگەھەکا دیتر ژێکجودا بن.

- ئەگەر ئەنجامێ پشکنینێ بلندتر بوو ژ ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئانکو ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا هەوکرنێ.

**تێبینی:**

پتریا ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینان ژ تاقیگەھەکێ بۆ تاقیگەھەکا دیتر ژێکجودانە.


ASO Positive


ASO Negative


ASO Negative

**پشکنینا دەستنیشانکرنا دژەتەنێ بەکتریا Strep ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:**

- Antistreptolysin O Titer Test
- ASOT
- ASO
- ASO Titer
- ASO Test
- T-ASO
- ASO Titer Test

## پشکنینا (حم المالتا) Rose Bengal (Brucella) Test

حم المالتا نەخۆشـــییەکا ئاژەلییە ژ ئەگەرێ گرۆپێ بەکتریا ژ جینا *Brucella* دروســـت دبن، د شیاندایە مرۆڤ و ئاژەلان تووشی نەخۆشییێ بکەت، مرۆڤ ب ڕێکا نێزیکبوون یان خوارن و ڤەخوارنا شـیر و گوشت و بەرهەمێن هندەك ئاژەلان دهێتە ڤەگوهاستن و تووشی نەخۆشـییێ دبن، ژ بۆ خۆپاراسـتن ژ ئەڤێ نەخۆشییێ پێدڤییە دەست ل ئاژەلێن مرداربووی نەدەین یان ل دەمێ خوارن و ڤەخوارنا بەرهەمێن ئاژەلی پێدڤییە ب باشـی بهێنە شـویشتن و کەلاندن بەری بهێنە بکارهینان.

ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا Brucella:

- ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ پێدڤییە نەرێنی (Negative) بیت.



ژ نیشانێن تووشبوون ب نەخۆشییا حم المالتا:

1. تا.
2. کێمبوونا حەزا خوارنێ.
3. خوهدان.
4. هەستکرن بماندیبوونێ.
5. ئێشانا گەھ و ماسۆلکەیان.
6. پشت ئێشان.
7. سەرئێشان.

پشکنینا Brucella ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Brucella Test
- Brucella Test by 2ME
- Rose Bengal Test
- Malta Fever Test
- BAT Test
- BAT



## پشکنینا گرانەتا Typhoid Fever (Widal Test)

مفا ژ پشـــکنینا Typhoid Fever دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەســـتنیشـــانکرنا گراناتایێ ئەوا ژ ئەگەرێ بەکتریا *Salmonella typhi* (*S typhi*) تووشـــی مرۆڤان دبیت، **دهێتە هژمارتن ژ نەخۆشـــییێن گرێدایی کۆئەندامێ هەرسێ، بەکتریا ب ڕێکا خوارن و ڤەخوارنا پیسبوویی ب بەکتریا دەرباز دبیتە د ناڤ لەشێ مرۆڤاندا.**

**ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا Widal:**

- **ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ پێدڤییە نەرێنی (Negative) بیت.**



## نیشانێن نەخۆشییێ:

1. تایەکا دژوار.
2. هەستکرن ب لاوازبوونێ.
3. ئێشانا گەدەی.
4. سەرئێشان.
5. کێمبوونا حەزا خوارنێ.
6. زکچوون.
7. گێژبوون.

## پشکنینا Typhoid Fever ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Typhoid Fever Test
- Widal Test
- WAT
- WidalT
- WAT Test



Dep. Infections Disease Tests

## پشکنینا بەکتریا گەدەی Helicobacter Pylori / H. Pylori

دشیاندایە ب رێکا خوین و پیساتی و هەناسەدانێ پشکنینا بەکتریا *H. Pylori* ئەنجامبدەین، بەکتریا *Helicobacter Pylori* تووشی کۆئەندامێ هەرسکرنێ دبیت، ژمارەیەکا زۆر ژ مرۆڤێن هەلگرێن بەکتریا *H. pylori* چ نیشان ل دەڤ دەرناکەڤن، بەلێ دشیانێن ئەڤێ بەکریایێدا هەیە ببیتە ئەگەرێ گەلەک ژ ئاریشەیێن گرێدایی هەرسکرنێ وەکی هەوکرنا گەدەی Gastritis، Peptic Ulcers (هەبوونا برینان ل گەدەی و ریڤیکێن بچویک و سورینچکێ)، و هندەک ژ جورێن پەنجەشێرا گەدەی.

رێژەیا ئاسایی یا پشکنینا بەکتریا گەدەی *H. Pylori*:

- پێدڤییە رێژەیا ئاسایی نەرێنی (Negative) بیت.



## بۆچی پێدڤییە پشکنینا بەکتریا *H. pylori* بهێتە ئەنجامدان؟

1. ژ بۆ دەستنیشانکرنا بەکتریایێ دناڤ کۆئەندامێ هەرسکرنێدا.
2. ژ بۆ پشتراستبوون ژ بەکتریا *H. pylori* دناڤ گەدەیدا ب تایبەت ل دەمێ هەبوونا نیشانێن نەخۆشییێ.
3. ژ بۆ چاڤدێریکرنا چارەسەرییێن ژ بۆ بەکتریا *H. pylori* ب نەخۆشی هاتینەدان ئەرێ کاریگەری ل سەر نەخۆشی پەیداکریە یان ژیک نە ل ژێر ڕاوێژ و چاڤدێرییا نۆژدارێ تایبەتمەندڤە.

## کەنگی پێدڤییە پشکنینا بەکتریا گەدەی *H. pylori* بهێتە ئەنجامدان؟

دێ پێدڤی ب پشکنینێ بی ل دەمێ هەبوونا نیشانێن تووشبوون ب ئاریشەیێن گرێدایی هەرسکرنێڤە وەکی....

1. زک ئێشان.
2. هەلاڤێتن.
3. زکچوون.
4. کێمبوونا حەزا خوارنێ.
5. کێمبوونا کێشا لەشی.
6. وەرمتن.



## پشکنینا بەکتریا گەدەی *H. pylori* ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Helicobacter Pylori Tests
- H. Pylori Tests
- H. pylori stool antigen
- Fecal H. Pylori Ag
- H. pylori breath tests
- Urea Breath Test
- UBT
- rapid urease test (RUT) for H. pylori
- H. pylori culture



## پشکنینا هەوایی ژ بۆ بەکتریا گەدەی Urea Breath Test

مفا ژ پشکنینا Urea Breath Test دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا بەکتریا گەدەی *H. Pylori* (*Helicobacter Pylori*) ب ڕێکا هەوایی (پرۆسێسا ئەنجامدانا پشکنینا Urea Breath Test د لاپەڕێن داهاتیدا ب شێوەیەکێ بەرفرەهـ هاتییە بەحسکرن و شرۆڤەکرن)، هەوکرنا گەدەی ب بەکتریا *Helicobacter Pylori* ب ئەگەرێ سەرەکییێ برینا گەدەی و دوازدە گرێیێ (قرحة الاثني عشر) دهێتە هژمارتن، ب ڕێکا پشکنینا هەوای ژ بۆ بەکتریا *H. Pylori* یا گەدەی د شیاندایە پێزانینان وەربگرین ژ بۆ دەستنیشانکرنا هەبوونا بەکتریایێ دناڤ لەشێ نەخۆشیدا و هەروەسا ل دەمێ هەبوون و سەلماندنا بەکتریایێ دناڤ گەدەیێ نەخۆشیدا و پشتی وەرگرتنا چارەسەرییێ پێدڤییە پشکنینێ دووبارە ئەنجام بدەین ژ بۆ هندێ بهێتە زانین چارەسەرییێن ب نەخۆشی هاتینە دان بەرسڤدانەکا باش هەبوویە یان نە، پتر ژ ڕێژەیا 50% ژ مرۆڤێن سەرانسەری جیهانێ بەکتریا گەدەی *H. Pylori* هەیە، د شیانێن بەکتریا *H. Pylori* دا هەیە ببیتە ئەگەرێ مەترسییێ ژ بۆ سەر لەشێ مرۆڤی ب هەوکرنا گەدەی و هەتا دگەهیتە پەنجەشێرا گەدەی.

### ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا هەوای ژ بۆ بەکتریا گەدەی Urea Breath Test:

- پێدڤییە ڕێژەیا ئاسایی نەرێنی (Negative) بیت.



**بەکتریا *H. Pylori* چییە؟**

**بەکتریا Helicobacter pylori گەدەی (المعدة - Stomach) یان دوازدە گرێیێ (دوازدە گرێ چییە؟ بەشێ ئێکێ یێن ڕیڤیکا زراڤە) تووش دکەت، تووشبوون ب بەکتریا *H. Pylori* مەترسییا تووشبوونێ زێدەتر دکەت ب....**

1. **هەوکرنا گەدەی Gastritis**
2. **تووشبوون ب برینا گەدەی (القرحة الهضمية - Peptic ulcer) (برینا دوازدە گرێیێ یان برینا گەدەییە).**
3. **تووشبوون ب پەنجەشێرا گەدەی Stomach (gastric) Cancer**

**کەنگی پێدڤییە پشکنینا هەوای ژ بۆ بەکتریا گەدەی Urea Breath Test بهێتە ئەنجامدان؟**

**پێدڤییە پشکنینا هەوای ژ بۆ بەکتریا گەدەی Urea Breath Test بهێتە ئەنجامدان ل دەمێ هەبوونا نیشانێن تووشبوون ب بەکتریا *H. Pylori* د کۆئەندامێ هەرسێدا یان نیشانێن برینا گەدەی، وەکی نیشانێن ل خوارێ ئاماژە پێکری....**

1. **هەستکرن ب ئێشانەکا وەکی سۆتنێ ل ناڤ گەدەی (المعدة - Stomach) دا ل ناڤەراست یان بەشێ سەرییێ گەدەیدا ب تایبەتی د ناڤبەرا ژەم(دان)ێن خوارنێدا یان ل دەمێ نڤستنێ ب شەڤ.**
2. **هەبوونا ئێشانێ و چوونا ئێشانێ ل دەمێ خوارنێ یان ل دەمێ ب کارهینانا دەرمانێن دژەترش.**
3. **وەرمتنا زکی.**
4. **زکچوون.**
5. **هەلاڤێتن.**
6. **کێمبوونا کێشا لەشی بێی هەبوونا ئەگەرەک دەستنیشانکری.**

**بۆچی پێدڤییە پشکنینا هەوای ژ بۆ بەکتریا گەدەی Urea Breath Test بهێتە ئەنجامدان؟**

1. دەستنیشانکرنا بەکتریا گەدەی H. Pylori (Helicobacter Pylori)
2. دەستنیشانکرنا هەوکرنا چالاک یا بەکتریا H. Pylori
3. ژ بۆ چاڤدێریکرنا چارەسەرییا ب نەخۆشی هاتییە دان پشتی دەستنیشانکرنا بارودۆخێ نەخۆشی ب تووشبوون ب بەکتریا H. Pylori

**چ ل سەر تە پێدڤییە ئەنجام بدەی بەری ئەنجامدانا پشکنینا هەوای ژ بۆ بەکتریا گەدەی Urea Breath Test؟**

☒ دوو هەفتییان دویربکەڤە ژ بکارهینانا دەرمان و چارەسەرییێن وەکی omeprazole (Prilosec), lansoprazole (Prevacid), pantoprazole (Protonix), esomeprazole (Nexium), dexlansoprazole ،rabeprazole (AcipHex) (Dexilant)

☒ بێی نۆژدارێ تایبەتمەند چ چارەسەرییان نەڕاوستینە، بەری دەرمان و چارەسەرییان ب ڕاوستینی پێخەمەت ئەنجامدانا پشکنینێ نۆژدارێ خۆ یێ تایبەتمەند ئاگەهدار بکە.

☒ دوو دەمژمێر و نیڤ هەتا چار دەمژمێران ب ڕۆژیبە، دویربکەڤە ژ هەمی جۆرێن خوارن و ڤەخوارنان (هەتا ئاڤێ ژیک).

## چەوانییا ئەنجامدانا پشکنینا هەوای ژ بۆ بەکتریا گەدەی ب شێوەیەکێ زانستی و دروست:

ل سەر نۆژدار و کارمەندێ تاقیگەهێ ئەرک و پێدڤییە پێش ئەنجامدانا پشکنینێ هەمی پێنگاڤان ژ بۆ نەخۆشی ڕۆن و شرۆڤەبکەت بەری ئەنجامدانا پشکنینێ ب شێوەیەکێ تێر و تەسەل....

### پێنگاڤا ئێکێ: (گرنگترین پێنگاڤ)!

- پێدڤییە هەمی مەرجێن پێش ئەنجامدانا پشکنینێ تە ئەنجامدابن و ب جههینابن (ئەو مەرجێن د لاپەڕێ چوویدا هاتینە بەحسکرن و شرۆڤەکرن) ب شێوەیەکێ دروست، ژبەر کو پەیرەونەکرن و پشتگوهـ هاڤێتنا مەرجێن بەری ئەنجامدانا پشکنینا هەوای ژ بۆ بەکتریا گەدەی Urea Breath Test ب شێوەیەکێ ڕاستەوخۆ و ئێکسەر دێ کارتێکرنێ ل سەر ئەنجامێ پشکنینێ کەت.

### پێنگاڤا دوویێ:

- کارمەندێ تاقیگەهێ دێ حەبەکێ ڕادەستی تە کەت کو یوریا یا دناڤدا یا تایبەتمەندە ب پشکنینا بەکتریا گەدەی Urea Breath Test ڤە.

### پێنگاڤا سێیێ:

- ئەو حەبا کارمەندێ تاقیگەهێ ڕادەستی تەکری دێ دگەل ڕێژەیەکا ئاڤێ قووتدەی.

### پێنگاڤا چارێ:

- پازدە خۆلەکان (٩٠٠ چرکەیان) دێ چاڤەڕێ بی (ب چ ڕەنگان هیچ خوارن و ڤەخوارنێ د ئەوان پازدە خۆلەکاندا بکارنەهینە (ب ڕۆژیبە)).

**پێنگاڤا پێنجێ:**

- کیسێ ئەنجامدانا پشکنینێ نەخۆش تا جهێ دەستنیشانکری دێ کەتە د دەڤێ خۆ دا پاشان هەناسەیێ ب ڕێکا دفنێ پێدڤییە نەخۆش ب هەلکێشیت ب شێوەیەکێ باش پاشی بەردانا هەوای ب ڕێکا دەڤی ژ بۆ کیسێ پشکنینێ پاشی دووبارە ئەڤێ کریارێ دێ ئەنجامدەت ژ بۆ ماوەیێ سێ هەتا چار خولەکان، ڤان پێنگاڤێن ل خوارێ بەرچاڤ وەربگرە....

  ☒ ب چ ڕەنگان نەهێلە نەخۆش ئاڤا دەڤێ(تفا)خۆ دگەل بەردانا هەوای ژ بۆ کیسێ پشکنینێ بەردەتە د ناڤ کیسیدا.

  ☒ نابیت سەرێ نەخۆشی یێ چەماندی بیت ژبەر کو ب ڤێ چەندێ مەترسییا گێژبوونێ ل دەڤ نەخۆشی زێدەتر لێ دهێت.

**پێنگاڤا شەشێ:**

**پشتی ب دوماهیک هاتنا ماوەیێ پشکنینێ دێ کیسێ پشکنینێ ڕادەستی کارمەندێ تاقیگەهێ کەی و دێ ل پرستگەهێ چاڤەڕێی ئەنجامێن پشکنینا خۆ بی (پتریا جاران ب تنێ حەفت هەتا پازدە خولەکان ئەنجامێ پشکنینێ گیرو دبیت).**

**پشکنینا هەوای ژ بۆ بەکتریا گەدەی *H. Pylori* ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:**

- Urea Breath Test
- UBT
- Urea Breath
- Breath Test for H. Pylori
- Breath Tes
- t for Helicobacter Pylori

## پشکنینا نەخۆشییا پشیکان Toxoplasma gondii Test

نەخۆشییا Toxoplasmosis هەوکرنەکە تووشی مرۆڤان دبیت ژ ئەگەرێ مشەخۆرێ Toxoplasma gondii، دشیاندایە مشەخۆرێ Toxoplasma gondii دەستنیشان بکەین ب رێکا پشکنینێن سیرۆلوژی یان ب رێکا پشکنینێن Molecular ێ، پشکنینێن سیرۆلوژی ژ بۆ مشەخۆرێ Toxoplasma gondii چنە؟ دژەتەنێن دناڤ خوینێدا دەستنیشان دکەت یێن وەکی بەرسڤدانەک ل دژی هەوکرنێ هاتینە بەرهەمهینان ل دویڤ جۆرێ دژەتەنی (IgM,IgG) د شیاندایە ب رێکا ڤان پشکنینان دەستنیشان بکەین ئەرێ هەوکرن یا نوییە یان یا رابردوویە. پشکنینێن Molecular ێ ژ بۆ مشەخۆرێ Toxoplasma gondii چنە؟ وەکی ب رێکا PCR بۆماوەمادەیێ DNA یێ مشەخۆری دەستنیشان دکەت دناڤ خوینێدا و ئاماژەیە ژ بۆ هەوکرنەکا تۆند. ل دەمێ تووشبوون ب مشەخۆرێ Toxoplasma gondii ل دەڤ پتریا مرۆڤان چ نیشان ل سەر دەرناکەڤن یان تنێ هندەک نیشانێن سڤک یێن وەکی ئەنفلەوانزایێ ل سەر دەردکەڤن، بەلێ ل دەمێ تووشبوون ب مشەخۆرێ Toxoplasma gondii ل دەڤ ژنێن دووگیان و ڤەگوهاستنا مشەخۆری ژ بۆ زارۆکێ ژ دایکنەبوویی د زکێ دەیکا دووگیاندا، یان کەسەکی سیستەمێ بەرگرییا لەشێ وی یا لاوازبیت ل ڤی دەمی دشیانێن مشەخۆرێ Toxoplasma gondii دا هەیە ئاریشێن ترسناکێن تەندرۆستی دروست بکەت.




رێژەیا ئاسایی یا پشکنینا نەخۆشییا پشیکان:

- پێدڤییە رێژەیا ئاسایی نەرێنی (Negative) بیت.

**ب ڤان ڕێکێن ل خوارێ دیارکری دشیاندایە مشەخۆرێ Toxoplasma gondii بهێتە ڤەگوهاستن ژ بۆ مرۆڤان:**

1. خوارنا خارنێن پیسبووی، ب تایبەتی خوارنا گۆشتی ب خاڤی یان یێ نەچێبووی.
2. خوارنا ئەوان فێقی و کەسکاتییێن ل جهێن پیس دهێنە چاندن و باش نەشیشتنا وان.
3. ڤەخوارنا ئاڤا پیس.
4. بەرکەڤتن دگەل پاشماوەیێن پشیکێن پیسبووی.
5. ڤەگوهاستن ب ڕێکا دەیکێ ژ بۆ زارۆکی.
6. د بارودۆخێن گەلەکێن دەگمەندا، ڤەگوهاستن ل دەمێ چاندنا ئەندامێن لەشیدا یان وەرگرتنا خوینێ.



## بۆچی پێدڤییە پشکنینا مشەخۆرێ Toxoplasma gondii بهێتە ئەنجامدان؟

1. ئافرەتا دووگیان بەری دووگیانبوون و هەروەسا پشتی دووگیانبوونێ ژ بۆ هندێ بهێتە دەستنیشانکرن ئەرێ بەرکەفتن دگەل مشەخۆرێ Toxoplasma gondii هەبوویە یان نە.
2. ئافرەتا دووگیان ل دەمێ هەبوونا گومانا تووشبوون ب مشەخۆرێ Toxoplasma gondii
3. کەسەکی ئاریشەیێن گرێدایی سیستەمێ بەرگرییا لەشی هەبن یان سیستەمێ بەرگرییا لەشی یا لاواز هەی.
4. کەسەکی نیشانێن نەخۆشییا Toxoplasmosis ل دەڤ هەبن.
5. ل دەڤ زارۆکێ ژدایکنەبووی، ل دەمێ هەبوونا گومانا مشەخۆرێ Toxoplasma gondii

## نیشانێن تووشبوون ب مشەخۆرێ Toxoplasma gondii یان نەخۆشییا Toxoplasmosis:

1. وەرمتنا گرێیێن لیمفاوی.
2. تا، تا ب تایبەتی بشەڤ.
3. بەردەوام هەستکرن ب لاوازبوون وماندیبوونێ.
4. سەرئێشان.
5. لەش ئێشان.
6. هندەک جاران ئێشانا حەفکێ.



### چەوانییا خۆپاراستن ژ مشەخۆرێ Toxoplasma gondii:

1. ئەگەر تو پشیکان خۆدان دکەی ل دەمێ سندوقا پاشماوەیێن پشیکێ پاکژ دکەی بلا دەستکێش و ماسک ل بەر تەبن.
2. ئەگەر تو پشیکان خۆدان دکەی نەهێلە بچیتە ژ دەرڤە ژ بۆ هندێ بهێتە پاراستن ژ ئاڤ و تشتێن پیس نەخۆتن و هەروەسا گۆشتێ خاڤ نەدێ.
3. ئەگەر تو یا ب دووگیان بی پشیکێن نوی نەهینە دناڤ مال دا و خۆ دویربێخە ژ دەستکرنا پشیکێن سەرجادە و یێن بێ سەرپەرشت.
4. ل دەمێ کارکرنێدا ل ناڤ باخچە و بیستانان دا دەستکێشان ب کاربینە.
5. ئەو پارچەیا داری یان کەرەستەیێ دهێتە ب کارهینان ژ بۆ دروستکرنا گۆشتێ خاڤ ب ئاڤەکا گەرم و سابینێ رۆژانە پاکژ بکە.
6. کەسکاتی و فێقی ب باشی بشۆ.



### پشکنینا نەخۆشییا پشیکان ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Toxoplasma gondii Test
- ToxoP Test
- Toxoplasma gondii
- ToxoPG Test

## پشکنینا Syphilis Test / Syphilis

ئێک ژ بەربەلاڤترین نەخۆشییێن ب رێکا سێکسی دهێنە ڤەگوهاستن نەخۆشییا *Syphilis* ـــە ، *Syphilis* چییە؟ هەوکرنەکا بەکتریاییە بەلاڤەدبیت ب رێکا ئەندامێ زاوزێ یان ب رێکا ماچکرنا لێڤێن کەسێ تووشبووی یان کرنا کریارا سێکسی دگەل کەسێ تووشبووی، گەشەیا Syphilis ێ دبیت ژ بۆ ماوەیێ هەفتیان، هەیڤان یان سالان ڤەبکێشیت، ل دەستپێکێ پتریا جاران پەیدا دبیت ژ برینێن بچویک و بێ ئێشان دناڤ دەڤ و ئەندامێ زاوزێ و ئەندامێ پشتێ(کۆم - المستقیم - Rectal) دا، و د قوناخا دویڤدا هندەک نیشانێن وەکی ئەنفلەوانزایێ یان ئاریشەیێن گرێدایی پیستی پەیدادبن، و د قوناخێن دووماهیکێدا ژ تووشبوون ب بەکتریا *Syphilis* د شیاندایە کاریگەرییێن خراب ل سەر مێشک و دل و ستریەبەندک و...هتد پەیدا بکەت، پشکنینا Syphilis یا هاریکارە ژ بۆ دەستنیشانکرنا نەخۆشییا *Syphilis* ێ د قوناخا دەستپێکێدا ژ تووشبوونێ، ب ڤی شێوەیی قوناخێن چارەسەرییێ ژیک دێ ب ساناهی بن.

### رێژەیا ئاسایی یا پشکنینا Syphilis:

- پێدڤییە رێژەیا ئاسایی نەرێنی (Negative) بیت.



### بۆچی پێدڤییە پشکنینا Syphilis بهێتە ئەنجامدان؟

ژ بۆ پشکنینکرن و دەستنیشانکرنا *Syphilis* ێ. ئەگەر ئافرەت یا ب دووگیان بیت پێدڤییە پشکنینا *Syphilis* ێ ئەنجام بدەت. دشیاندایە *Syphilis* ب هێتە ڤەگوهاستن ژ دەیکا دووگیان بۆ زارۆکی، باشترە هەمی ئافرەتێن دووگیان ل دەستپێکا قوناخا دووگیانبوونێدا پشکنینێ ئەنجامبدەن، ب تایبەت ئافرەتێن پتر مەترسییا تووشبوونێ ل دەڤ هەی پێدڤییە د سێ هەیڤێن دووماهیکێ ژ دووگیانبوونێدا دووبارە پشکنینێ ئەنجامبدەن.

### کەنگی پێدڤییە پشکنینا Syphilis بهێتە ئەنجامدان؟

دێ پێدڤی ب پشکنینێ بی ل دەمێ کرنا کریارا سێکسی دگەل کەسێ تووشبووی یان گومانلێکرن لێ، یان ل دەمێ هەبوونا نیشانێن تووشبوون ب *Syphilis* ێ.

### نیشانێن تووشبوون ب *Syphilis*:

پتریا جاران نیشانێن تووشبوون ب *Syphilis* ێ پشتی دوو هەتا سێ هەفتییان ژ تووشبوونێ سەرهلددەن ژوان نیشانان....

1. هەبوونا برینەکا بچویک و بێ ئێشان دناڤ دەڤ و ئەندامێ زاوزێ، ئەندامێ پشتێ(کۆم - المستقیم - Rectal) دا.
2. ئاریشەیێن گرێدایی پیستی.
3. تا.
4. سەرئێشان.
5. وەرمتنا ڕژێنان.
6. هەستکرن ب ماندیبوونێ.
7. کێمبوونا کێشا لەشی.
8. کێمبوونا موویێن پرچێ.



هەتا ل دەمێ نەبوونا هیچ نیشانەیەکا تووشبوون ب *Syphilis* پێدڤییە پشکنین بهێتە ئەنجامدان ل دەمێ هەبوونا مەترسییێن تووشبوون ب *Syphilis* وەکی....

1. ل دەمێ کریارا سێکسی یا ب کومەڵ دهێتە ئەنجامدان.
2. ل دەمێ کریارا سێکسی بهێتە ئەنجامدان بێی ب کارهینانا کۆندومان.
3. ل دەمێ هەبوونا ڤایرۆسێ HIV یان نەخۆشییا ئایدز.
4. ل دەمێ هەبوونا نەخۆشییێن دیتر یێن ب رێکا سێکسی دهێنە ڤەگوهاستن وەکی Gonorrhea (د لاپەرێ داهاتیدا پشکنینا Gonorrhea هاتییە شرۆڤەکرن).




پشکنینا Syphilis ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Syphilis Tests
- Rapid Plasma Reagin (RPR)
- Venereal Disease Research Laboratory (VDRL)
- Fluorescent Treponemal Antibody Absorption (FTA-ABS) Test
- Agglutination Assay (TPPA)

## پشکنینا Gonorrhea / Gonorrhea Test

ئێک ژ بەربەلاڤترین نەخۆشییێن ب ڕێکا سێکسی دهێنە ڤەگوهاستن *Gonorrhea* یە، *Gonorrhea* چییە؟ هەوکرنەکا بەکتریاییە بەلاڤەدبیت ب ڕێکا دەڤ و ئەندامێ زاوزێ و هەروەسا ئەندامێ پشتێ (کۆم - المستقیم - Rectal) دگەل کەسێ تووشبووی، هەروەسا د شیاندایە بهێتە ڤەگوهاستن ب ڕێکا دەیکا دووگیان ژ بۆ زارۆکی د ماوەیێ ژدایکبوونێدا، د شیانێن *Gonorrhea* دا هەیە هەردوو ڕەگەزان تووشی هەوکرنێ بکەت، پتر دناڤ گەنجاندا دهێتە دیتن د ماوەیێ ژیێ ١٥ هەتا ٢٤ سالییێدا. گەلەک ژ مرۆڤان ل دەمێ تووشبوون ب *Gonorrhea* د بێ ئاگەهن ژ تووشبوونێ و دهێتە ڤەگوهاستن ژ بۆ هندەک کەسێن دیتر بێی هەستکرن ب تووشبوونێ ب *Gonorrhea* یێ، ل دەڤ ڕەگەزێ نێر هندەک نیشان ل دەڤ دەردکەڤن، بەلێ ل دەڤ ڕەگەزێ مێ چ نیشان یان هەبوونا نیشانێن ئاریشەیێن تەندرۆستی یێن گرێدایی د میزلدان و ئەندامێ زاوزێدا دەرناکەڤن. پشکنینا *Gonorrhea* دەستنیشان دکەت ئەرێ چەند ژ ڕێژەیا بەکتریا *Gonorrhea* دناڤ لەشیدا هەبوون هەیە، د شیاندایە نەخۆشییا *Gonorrhea* بهێتە چارەسەرکرن ب ڕێکا دەرمانێن دژە زیندەیی Antibiotics، بەلێ ئەگەر بۆ ماوەیەکێ درێژ نەهاتە چارەسەرکرن دشیاندا هەیە ببیتە ئەگەرێ نەزوکییێ و هەروەسا ئاریشێن دیتر یێن ترسناکێن تەندرۆستی، ل دەڤ ئافرەتان د شیاندایە ببیتە ئەگەرێ هەوکرنێ دناڤ حەوزێدا و بارودۆخێ Ectopic Pregnancy، بارودۆخێ Ectopic Pregnancy چییە؟ بریتییە ژ دووگیانبوونا ژ دەرڤەی مالبچویکی، ئەگەر ب شێوەیەکێ ب لەز نەهێتە چارەسەرکرن دبیت ببیتە ئەگەرێ ژ دەستدانا ئافرەتا دووگیان، ل دەڤ زەلامان دشیاندایە ببیتە ئەگەرێ ئێشانێ ل دەمێ میزکرنێ و هەبوونا ئاریشەیان د بۆرییا میزێدا.



**ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا Gonorrhea:**

- **پێدڤییە ڕێژەیا ئاسایی نەرێنی (Negative) بیت.**

**بۆچی پێدڤییە پشکنینا بەکتریا Gonorrhea بهێتە ئەنجامدان؟**

**ژ بۆ دەستنیشانکرنا بەکتریا *Gonorrhea* دهێتە ئەنجامدان. هندەک جاران پشکنینا Gonorrhea دگەل پشکنینا Chlamydia (دلاپەڕێن داهاتیدا پشکنینا Chlamydia یا هاتییە بەحسکرن ب شێوەیەکێ تێر و تەسەل) پێکڤە دهێنە ئەنجامدان، *Chlamydia* جورەکێ دییە ژ ئەوان نەخۆشییێن بەربەلاڤ یێن ب ڕێکا سێکسی دهێنە ڤەگوهاستن. هەردووک نیشانێن Gonorrhea و Chlamydia نێزیکی ئێکن و پتریا جاران ب ڕێکا سێکسی دبیت پێکڤە بهێنە ڤەگوهاستن.**

**کەنگی پێدڤییە پشکنینا بەکتریا Gonorrhea بهێتە ئەنجامدان؟**

**ل دویڤ دەزگەهێ CDC پێدڤییە هەر ئافرەتەکا کریارێن سێکسی ئەنجامددەت و یا چالاک بیت د ئەڤی بواریدا د بن ژییێ ٢٥ سالییێدا پێدڤییە پشکنینا Gonorrhea ئەنجامبدەن. هەروەسا هەتا ئافرەتێن د سەر ژییێ ٢٥ سالییێدا ژی پێدڤییە پشکنینێ ئەنجامبدەت ب تایبەت ل دەمێ هەبوونا پتر مەترسییێن تووشبوون ب *Gonorrhea* ژوان مەترسییان....**

1. **کرنا کریارا سێکسی یا ب کۆمەڵ.**
2. **تووشبوون ب بەکتریا *Gonorrhea* د ماوەیێ ڕابردوویدا.**
3. **ل دەمێ هەبوونا هندەک نەخۆشییێن دیتر یێن ب ڕێکا سێکسی دهێنە ڤەگوهاستن.**
4. **ل دەمێ کرنا کریارا سێکسی دگەل کەسەکی بکەت کو هەلگرێ ئێک ژ نەخۆشییێن ب ڕێکا سێکسی دهێنە ڤەگوهاستن بیت.**
5. **ب کارنەهینان و هەروەسا دروست ب کارنەهینانا کۆندومی ل دەمێ هەر کریارەکا سێکسیدا بیت یا نە دروست.**
6. **ڕەگەزێ نێر کریارا سێکسی دگەل ڕەگەزێ نێر ئەنجامبدەت.**

**نیشانێن تووشبوون ب بەکتریا *Gonorrhea*:**

**هەردوو ڕەگەز ل دەمێ هەبوونا نیشانێن تووشبوون ب *Gonorrhea* یێ پێدڤییە پشکنینێ ئەنجامبدەن....**

**ل دەڤ ڕەگەزێ مێ:**

1. دەرهاڤێژێن نەئاسایی یێن ئەندامێ زاوزێ.
2. دیتنا خوینێ ماوە ماوە.
3. زک ئێشان.
4. هەبوونا ئێشانێ د ماوەیێ کرنا کریارا سێکسیدا.
5. هەبوونا ئێشانێ ل دەمێ میزکرنێدا.

**تێبینی:**

- ئەگەر ئافرەت یا ب دووگیان بیت پێدڤییە د قوناخێن دەستپێکێ یێن دووگیانییێدا پشکنینا بەکتریا *Gonorrhea* ئەنجامبدەت، ژبەر کو دشیاندایە بهێتە ڤەگوهاستن ژ بۆ زارۆکی د ماوەیێ زارۆکبوونێدا و ئاریشەیێن مەترسیدار دروست بکەت، ل دەمێ هەبوونا تووشبوون ب بەکتریا *Gonorrhea* د ماوەیێ دووگیانییێدا نۆژدار دێ دەرمانێن دژەزیندەیی Antibiotic ب نەخۆشی دەت ژ بۆ پاراستنا ئافرەتا دووگیان و زارۆکێ وێ.

**ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:**

1. ئێشانا گونان.
2. هەبوونا ئێشانێ ل دەمێ میزکرنێدا.
3. دەردانێن ب ڕەنگێ سپی، زەر، کەسک ژ ئەندامێ زاوزێ یێ نێرینە.



پشکنینا بەکتریا Gonorrhea ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Gonorrhea Test
- GC Test
- Gonorrhea
- Gonorrhea DNA Probe Test
- Gonorrhea Nucleic Acid Amplification Test
- GNAAT



## پشکنینا کلامیدیا Chlamydia Test

مفا ژ پشکنینا Chlamydia دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا بەکتریا کلامیدیا دناڤ لەشیدا، **Chlamydia چییە؟** دهێتە هژمارتن ئێک ژ بەربەلاڤترین نەخۆشییێن ب ڕێکا سێکسی دهێنە ڤەگوهاستن، *Chlamydia* هەوکرنەکا بەکتریاییە بەلاڤەدبیت ب ڕێکا دەڤ و ئەندامێ زاوزێ، ئەندامێ پشتێ (کۆم - المستقیم - Rectal) دگەل کەسێ تووشبووی. گەلەک ژ مرۆڤان ل دەمێ تووشبوون ب Chlamydia یێ د بێ ئاگەهن ژ تووشبوونێ و دهێتە ڤەگوهاستن ژ بۆ هندەک کەسێن دیتر بێی هەستکرن ب تووشبوونێ ب Chlamydia یێ. د شیاندایە ل دەمێ تووشبوونِ ب هەوکرنا کلامیدیایێ بهێتە چارەسەرکرن ب ڕێکا دەرمانێن دژە زیندەیی Antibiotics، بەلێ ئەگەر بۆ ماوەیەکێ درێژ نەهێتە چارەسەرکرن دشیاندا هەیە ببیتە ئەگەرێ نەزوکییێ و هەروەسا ئاریشێن دیتر یێن ترسناکێن تەندرۆستی، ل دەڤ ئافرەتان د شیاندایە ببیتە ئەگەرێ هەوکرنێ دناڤ حەوزێدا و Ectopic Pregnancy، **Ectopic Pregnancy چییە؟** بریتییە ژ دووگیانبوونا ژ دەرڤەی مالبچویکی، ئەگەر ب شێوەیەکێ ب لەز نەهێتە چارەسەرکرن دبیت ببیتە ئەگەرێ ژ دەستدانا ئافرەتا دووگیان، ل دەڤ زەلامان دشیاندایە ببیتە ئەگەرێ ئێشانێ ل دەمێ میزکرنێ و هەبوونا ئاریشەیان د بۆرییا میزێ و کۆئەندامێ میزێدا.

### ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا Chlamydia:

- پێدڤییە ڕێژەیا ئاسایی نەرێنی (Negative) بیت.



## بۆچی پێدڤییە پشکنینا بەکتریا Chlamydia دهێتە ئەنجامدان؟

ژ بۆ دەستنیشانکرنا بەکتریا کلامیدیا دهێتە ئەنجامدان. هندەک جاران پشکنینا Chlamydia دگەل پشکنینا Gonorrhea (د لاپەرێن چوویدا پشکنینا Gonorrhea یا هاتییە بەحسکرن و شرۆڤەکرن ب شێوەیەکێ تێر و تەسەل) پێکڤە دهێنە ئەنجامدان. هەردووک نیشانێن Gonorrhea و Chlamydia نێزیکی ئێکن و پتریا جاران ب رێکا سێکسی دبیت پێکڤە بهێنە ڤەگوهاستن.

## کەنگی پێدڤییە پشکنینا بەکتریا Chlamydia بهێتە ئەنجامدان؟

ل دویڤ دەزگەهێ CDC پتر ژ ملیون و نیڤا ژ ئانکجییێن خەلکێ ئەمریکا تووشی هەوکرنا بەکتریا کلامیدیا دبن سالانە، کلامیدیا پتر یا چالاکە ل دەڤ کەسێن ژییێ وان دناڤبەرا ١٥ بۆ ٢٤ سالییێدا و کریارا سێکسی بەردەوام ئەنجامددەن، پتریا هەلگرێن بەکتریا کلامیدیایێ چ نیشان ل دەڤ دیارناکەڤن، هەر ژبەر هندێ ل دویڤ دەزگەهێ CDC و رێکخراوێن دیتر یێن گرێدایی تەندرۆستییێ ل جیهانێ جەخت ل سەر هندێ دکەن ل دەمێ هەبوونا مەترسییێن پتر تووشبوونێ ب بەکتریا کلامیدیا باشترە سالانە ب بەردەوامی پشکنین بهێتە کرن ژبەر کو خۆپاراستن باشترە ژ چارەسەرییێ.



ئەو بارودۆخ و ئەگەرێن پتر مەترسییا تووشبوون ب بەکتریا کلامیدیا زێدەدکەن:

1. چالاکبوونا ئافرەتێ ژ بۆ کریارا سێکسی یا بەردەوام یا دبن ژییێ ٢٥ سالییێدا بیت.
2. ئافرەتەکا د سەر ژییێ ٢٥ سالییێدا بیت ل دەمێ هەبوونا پتر مەترسییێن تووشبوونێ.
3. کرنا کریارا سێکسی یا نەتەندرۆست.
4. تووشبوون ب بەکتریا Chlamydia د ماوەیێ ڕابردوویدا.
5. ل دەمێ هەبوونا هندەک نەخۆشییێن دیتر یێن ب ڕێکا سێکسی دهێنە ڤەگوهاستن.
6. ل دەمێ کرنا کریارا سێکسی دگەل کەسەکی کو هەلگرێ ئێک ژ نەخۆشییێن ب ڕێکا سێکسی دهێنە ڤەگوهاستن بیت.
7. ب کارنەهینان و هەروەسا دروست ب کارنەهینانا کۆندومی ل دەمێ هەر کریارەکا سێکسیدا بیت یا نە دروست.
8. ڕەگەزێ نێر کریارا سێکسی دگەل ڕەگەزێ نێر ئەنجامبدەت.

**تێبینی:**

- باشترە ئافرەتا دووگیان یا د بن ژییێ ٢٥ سالییێدا پشکنینێ ئەنجامبدەت، یان کەسەک تووشبووی بیت ب ڤایرۆسێ HIV



نیشانێن تووشبوون ب بەکتریا ***Chlamydia***:

هەردووک ڕەگەز ل دەمێ هەبوونا نیشانێن تووشبوون ب هەوکرنا بەکتریا ***Chlamydia*** یێ پێدڤییە پشکنینێ ئەنجامبدەن....

ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:

1. هەبوونا ئاریشەیان و ئێشانێ د هەردوو گوناندا.
2. هەبوونا دەرهاڤێژێن نەئاسایی یێن ئەندامێ زاوزێ.
3. هەبوونا ئێشانێ ل دەمێ میزکرنێ.
4. زۆربوونا جارێن میزکرنێ.

ل دەڤ ڕەگەزێ مێ:

1. ئێشانا گەدەی.
2. هەبوونا دەرهاڤێژێن نەئاسایی یێن ئەندامێ زاوزێ.
3. هەبوونا خوینبەربوونا نەئاسایی یا ئەندامێ زاوزێ.
4. هەبوونا ئێشانێ ل دەمێ کرنا کریارا سێکسی.
5. هەبوونا ئێشانێ ل دەمێ میزکرنێ.
6. زۆربوونا جارێن میزکرنێ.



هندەک ژ دەرمانێن دژەزیندەیی Antibiotics یێن ژ بۆ چارەسەرییا تووشبوونێ ب هەوکرنا بەکتریا کلامیدیا دهێنە بکارهینان:

- Azithromycin
- Doxycycline
- Erythromycin
- Levofloxacin
- Ofloxacin

**تێبینی:**

باشترە و پێدڤییە دەرمان ل ژێر چاڤدێری و ڕاوێژا نۆژدارێن تایبەتمەندڤە بهێنە ب کارهینان.

دێ چەوا خۆ پارێزم ژ تووشبوونێ ب بەکتریا کلامیدیا؟

1. دویرکەڤتن ژ چاڵاکبوونا کرنا کریارا سێکسی یا نەئاسایی و دگەل کەسێن جیاواز.
2. کرنا کریارا سێکسی ب تنێ دگەل ئێک کەس واتە دویرکەڤتن ژ کریارا سێکسی یا نەئاسایی.
3. ب کارهینانا کەرەستێن خۆپاراستنێ ل دەمێ کریارا جووتبوونێ وەکی ب کارهینانا کۆندومان.
4. ئەنجامدانا پشکنینا بەکتریا کلامیدیا ساڵانە.
5. دویرکەڤتن ژ پارڤەکرنا ئەوان تشتێن ل دەمێ کریارا جووتبوونێدا دهێنە ب کارهینان.



پشکنینا بەکتریا Chlamydia ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- **Chlamydia Test**
- **Chlamydia**
- **Chlamydia NAAT or NAT**
- **Chlamydia/GC STD Panel**

## پشکنینا مەلاریایێ Malaria Test

مەلاریا نەخوشییەکا مەترسیدارە ژ ئەگەرێ مشەخۆران تووشی مرۆڤان دبن، ئەو مشەخورێن دبنە ئەگەرێ مەلاریایێ دهێنە ڤەگوهاستن ب ڕێکا پێڤەدانا مێشێن تووشبووی، پتریا جاران نیشانێن دەستپێکی یێن تووشبوون ب مەلاریایێ وەکو نیشانێن ئەنفلەوانزایێ نە، پاشان دبیتە ئەگەرێ مەترسییێن ڕژد ل سەر تەندرۆستیيا مرۆڤان، مەلاریا پتر د ناوچەیێن گەرمدا یا بەربەلاڤە، مەلاریا دشیاندایە ب ڕێکا مێشان بهێتە ڤەگوهاستن ژ بۆ مرۆڤان، ل دەمێ گەهشتنا هندەک ژ مێشێن تایبەت ژ بۆ مرۆڤێن تووشبووی پاشان ل دەمێ پێڤەدانا مێشێن تایبەت ژ بۆ هەر کەسەکی دشێت تووش بکەت، پاشان مشەخور دێ چنە د ناڤا خرۆکێن سۆرێن خوینێدا و دێ بنە ئەگەرێ نەخوشییێ، ساڵانە ب ملیونان کەس تووشی مەلاریایێ دبن و هندەک ژ وان گیانێ خۆ ژ دەست ددەن و پتریا کەسێن گیانێ خۆ ژ دەست ددەن زارۆکن و ل وەڵاتێن ئەفریقیانە، ل دەمەکیدا مەلاریا پتر ژ ٨٥ وەڵاتان یا بەربەلاڤە بەلێ پتریا قوربانییێن مەلاریایێ ل وەڵاتێن ئەفریقیانە.

ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا مەلاریایێ:

- پێدڤییە ڕێژەیا ئاسایی نەرێنی (Negative) بیت.



## بۆچی پشکنینا مەلاریایێ دهێتە ئەنجامدان؟

پشکنینا مەلاریایێ ژ بۆ دەستنیشانکرنا مەلاریایێ مفا ژێ دهێتە وەرگرتن، ئەگەر د قوناخێن دەستپێکێدا نەخوشییا مەلاریایێ بهێتە دەستنیشانکرن د شیاندایە نەخوشی بهێتە کونترولکرن و چارەسەرکرن، بەلێ ئەگەر زوی نەهاتە چارەسەرکرن دێ بیتە ئەگەرێ بارودۆخێن ترسناکێن تەندرۆستی ژوان ژ کارکەڤتنا گولچیسکان، جگەر و هەروەسا خوینبەربوونا ناڤەکی.

## کەنگی پێدڤییە پشکنینا مەلاریایێ بهێتە ئەنجامدان؟

دێ پێدڤی ب پشکنینا مەلاریایێ بی ئەگەر تە گەشت کربیت ژ بۆ وەلاتێن پتر مەترسییا تووشبوونێ ب مەلاریایێ هەی و نیشان ل سەر لەشی دیاربن، پتریا جاران پشتی ١٤ رۆژان ژ پێڤەدانا مێشا تووشبووی نیشان دەردکەڤن ل سەر مرۆڤان بەلێ هندەک جاران پشتی حەفت رۆژان دبیت نیشان دەربکەڤن یان هەتا سالەکێ ژیک ڤەکێشن، وەکی ل دەستپێکێ ئاماژە پێ هاتییەکرن د قوناخێن دەستپێکێ یێن تووشبوون ب مەلاریایێ هەمان نیشانەیێن ئەنفلەوانزایێ هەنە.



## نیشانێن هەبوون و تووشبوون ب ئەنفلەوانزایێ:



1. تا.
2. لەرزین.
3. سەر ئێشان.
4. ماندیبوون.
5. لەش ئێشان.
6. هەلاڤێتن و هێلنج.

## نیشانێن گەهشتنا نەخۆشییێ ژ بۆ قوناخێن ب مەترسی و یێن دووماهیکێ یێن تووشبوون ب مەلاریایێ....

1. تایەکا توند.
2. هەبوونا خوینێ دگەل پیساتییێ.
3. گرژبوون.
4. زەرک.
5. لەرزین.
6. ماندیبوون.
7. تێکچوونا بارێ دەروونی.



## چەوانییا خۆپاراستن ژ مەلاریایێ:

ل دەمێ سەرەدانا جهێن گومانلێکری ب مەلاریایێ دکەی....

1. جهێ تەیێ نڤستنێ بلا یێ پاراستی بیت ژ هاتنا ژۆرا مێشان ژ بۆ جهێ نڤستنا تە ژ بۆ خۆ پاراستن ژ پێڤەدانا مێشان.
2. جلکێن درێژ لبەربکە بلا چ پارچەیێن لەشێ تە دیارنەکەن.
3. بەردەوام جلوبەرگێن خۆ باش بشو.
4. جهێ نڤستنێ پاکژبکە ب ڕێکا دەرمانێن دژەمشەخۆران.
5. نیشانێن تووشبوون ب مەلاریایێ بزانە .
6. ل دەمێ هەبوون و دەرکەڤتنا نیشانێن تووشبوون ب مەلاریایێ ئێکسەر سەرەدانا نەخوشخانەیێ بکە.



## ڕامانا ئەنجامێ پشکنینا مەلاریایێ:

- ئەگەر ئەنجامێ پشکنینێ ب نەرێنی دەرچوو ب ڕامانا نەتووشبوونێیە ب مەلاریایێ، بەلێ ل دەمێ هەبوونا نیشانێن تووشبوون ب مەلاریایێ باشترە دووبارە پشکنین ل دویڤ ڕاوێژا نۆژدارێ تایبەتمەند هەر ١٢ دەمژمێران جارەکێ ژ بۆ ماوەیێ ٢ هەتا ٤ ڕۆژان بهێتە کرن ژبەر کو گرنگە هەر زوی مەلاریا بهێتە دەستنیشانکرن.

- ئەگەر ئەنجامێ پشکنینێ ب ئەرێنی دەرچوو ب ڕامانا تووشبوونێ ب مەلاریایێ ڕادگەهینیت، چارەسەری ژ لایێ نۆژدارێ تایبەتمەند ڤە دێ هێتەدان ب نەخوشی ل دویڤ تەمەن، ڕەگەز، ڕێژەیا نەخوشییێ و ئەرێ ئافرەت یا ب دووگیانە یان نە و...هتد.

## پشکنینا مەلاریایێ ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Malaria Test
- Malaria
- Malaria Blood Smear
- Malaria Rapid Diagnostic Test
- Malaria by PCR



Dep. Tumor Marker Tests

## پشكنينا پەنجەشێرا هێلكەدانێ CA-125 Test

Cancer Antigen 125 (CA-125) پرۆتينەكە دهێتە ديتن د خانەيێن پەنجەشێرا هێلكەدانێدا، مفا ژ پشكنينا (Cancer Antigen 125) CA-125 دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنيشانكرنا رێژەيا پرۆتينێ Cancer Antigen 125 د ناڤ زڤرۆكا خوينێدا، رێژەيا بلند يا CA-125 دهێتە ديتن ل دەڤ ژنێن پەنجەشيرا هێلكەدانێ ل دەڤ وان هەی، پەنجەشێرا هێلكەدانێ پەيدا دبيت ل دەمێ زێدەبوونا خانەيان ب شێوەيەكێ نەئاسايى د ناڤ هێلكەدانا ژنێدا، پەنجەشێرا هێلكەدانێ ب ئەگەرێ پێنجێ يێ مرنا ژنان دهێتە هژمارتن ل وەلاتەكێ وەكی ئەمريكا (الولايات المتحدة).

رێژەيا ئاسايى يا پشكنينا پەنجەشێرا هێلكەدانێ:

- كێمتر بيت ژ: <46 U/mL



## بۆچی پشکنینا پەنجەشێرا هێلکەدانێ دهێتە ئەنجامدان؟

1. ژ بۆ دەستنیشانکرنا پەنجەشێرا هێلکەدانێ.
2. ژ بۆ چاڤدێریکرنا پەنجەشێرا هێلکەدانێ، ل دەمێ کێمبوونا ڕێژەیا پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ هندێ دەرمانێن ب نەخۆشێ هاتینە دان کارتێکرن یا دروست کری.
3. ژ بۆ پشکنینکرن و پشتڕاستبوون ژ نەمانا خانەیێن پەنجەشێرێ پشتی وەرگرتنا چارەسەرییا پێدڤی و نەمانا خانەیێن پەنجەشێرێ.
4. ژ بۆ پشتڕاستبوون ژ دووبارە سەرهلنەدانا پەنجەشێرێ پشتی وەرگرتنا چارەسەرییێ و نەمانا پەنجەشێرا هێلکەدانێ.

## کەنگی پێدڤییە پشکنینا پەنجەشێرا هێلکەدانێ بهێتە ئەنجامدان؟

دێ پێدڤی پشکنینا پەنجەشێرا هێلکەدانێ بی ل دەمێ هەبوونا مەترسییێن تووشبوون ب پەنجەشێرا هێلکەدانێ وەکی:

1. ل دەمێ هەبوونا جینێن بۆماوەیی پتر مەترسییا تووشبوونێ هەیە، ئەڤ جینە دهێنە نیاسین ب BRCA 1 یان BRCA 2
2. ل دەمێ هەبوونا مێژوویا خێزانێ و هەبوونا پەنجەشێرا هێلکەدانێ د ئەندامێن نێزیکێن خێزانێدا.
3. تووشبوون د ڕابردوویێدا ب پەنجەشێرا سینگی یان مالبچویک و قۆلۆنێ.



ب شێوەیەک گشتی هندەك بارودۆخ و نەخۆشی هەنە دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا CA-125 وەکی:

- دووگیانبوون.
- زڤڕۆکا هەیڤانە.
- هەبوونا گرێیان د مالبچویکیدا لێ نە یێن پەنجەشێرێ وەکی Uterine Fibroids
- هەبوونا پەنجەشێرا پەنکریاسێ.
- نەخۆشییێن گرێدایی هەوکرنێن حەوزێ Pelvic Inflammatory Disease
- هەبوونا پەنجەشێرێ د Endometrial and Fallopian Tube دا.




نیشانێن تووشبوون ب پەنجەشێرا هێلکەدانێ:

1. مەزنبوونا زکی.
2. بلەز هەستکرن ب تێربوونێ ل دەمێ خوارنێ.
3. کێمبوونا کێشا لەشی.
4. هەستکرن ب نەئارامبوونێ د ناوچەیا حەوزێدا.
5. زێدەبوونا جارێن میزکرنێ.



## رامانا ئەنجامێن پشکنینا پەنجەشێرا هێلکەدانێ:

ل دەمێ وەرگرتنا چارەسەرییێن پەنجەشێرا هێلکەدانێ پێدڤییە پشکنین بهێتە دووبارەکرن ژ بۆ زانینا کارتێکرنا دەرمانان:

- ئەگەر ئەنجامێ پشکنینێ کێم ببیت ب ئاماژەیەکا باش دهێتە هژمارتن ژ بۆ هندێ چارەسەرییێن ژ لایێ نۆژدارا تایبەتمەندڤە بۆ نەخۆشێ هاتینە دان کارتێکرنەکا باش ل سەر نەخۆشییێ پەیداکرییە.

- ئەگەر ئەنجامێ پشکنینێ بلندتر لێهات بیت ب ئاماژەیەکا نەباش دهێتە هژمارتن ژ بۆ هندێ چارەسەرییێن ژ لایێ نۆژدارا تایبەتمەندڤە بۆ نەخۆشێ هاتینە دان کارتێکرنەکا باش ل سەر نەخۆشییێ پەیدانەکرییە.

- ل دەمێ نەمانا نەخۆشییێ و ڕاوەستاندنا چارەسەرییێن ژ بۆ پەنجەشێرا هێلکەدانێ دهێنە دان ژ لایێ نۆژدارا تایبەتمەندڤە و ل دەمێ دووبارە پشکنینکرنێ و ئەنجامێ پشکنینێ بلندتر بیت ژ ڕێژەیا ئاسایی ئاماژەیە ژ بۆ دووبارە زڤڕین و سەرهلدانا خانەیێن پەنجەشێرا هێلکەدانێ.

**تێبینی:**

- ب شێوەیەک گشتی هندەك بارودۆخ و نەخۆشییێن دیتر هەنە دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا پشکنینا CA-125 د لاپەڕێن چوویدا هاتینە بەحسکرن.

پشکنینا پەنجەشێرا هێلکەدانێ ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- CA-125 Test
- CA125
- CA -125
- Cancer Antigen 125 Test
- Ovarian Cancer Antigen Test
- CA-125 Tumor Marker Test

## پشکنینا پەنجەشێرا سینگی CA 15-3 Test

پرۆتینێ (CA 15-3) Cancer Antigen 15-3 ژ لایێ ژمارەیەکا خانەیانڤە دهێتە دەردان، بەلێ ب ڕێژەیەکا زۆر ژ لایێ خانەیێن پەنجەشێرا سینگیڤە دهێتە دەردان، ژ بەر هندێ پتر ب پشکنینا پەنجەشێرا سینگی دهێتە نیاسین و بناڤکرن، ڕێژەیا بلند یا CA 15-3 دهێتە دیتن ل دەڤ ژنێن پەنجەشێرا سینگی ل دەڤ هەی و دهێتە ڤەگوهاستن ل بەشێن دی یێن لەشی و ب Metastatic Breast Cancer دهێتە نیاسین، د قۆناغێن دەستپێکێدا یێن تووشبوون ب پەنجەشێرا سینگی د شیاندا نینە پرۆتینێ Cancer Antigen 15-3 بهێنە دەستنیشانکرن ژ بەر کو د وی ماوەییدا گەلەک ب زەحمەت ڕێژەیا پشکنینێ ژ ڕێژەیا ئاسایی بلندتر لێ بهێت.

ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا پەنجەشێرا سینگی:

- کێمتر بیت ژ: <30 U/mL



## بۆچی پێدڤییە پشکنینا پەنجەشێرا سینگی بهێتە ئەنجامدان؟

1. ژ بۆ دەستنیشانکرنا پەنجەشێرا سینگی.
2. ژ بۆ زانینا کارتێکرنا دەرمانێن ژ لایێ نۆژدارێن تایبەتمەندڤە ژ بۆ نەخۆشی هاتینە دان.
3. ژ بۆ پشتڕاستبوون ژ دووبارە سەرهلنەدانا پەنجەشێرێ پشتی وەرگرتنا چارەسەرییێ و نەمانا پەنجەشێرا سینگی.




## د هندەك جۆرێن دیتر یێن پەنجەشێرێدا ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا پرۆتینێ CA 15-3 هەیە ژ وان:

1. پەنجەشێرا سیهان.
2. پەنجەشێرا قۆلۆنێ.
3. پەنجەشێرا پرۆستات.
4. پەنجەشێرا هێلکەدانێ.

رامانا ئەنجامێن پشکنینا پرۆتینێ Cancer Antigen 15-3 (CA 15-3):

- رێژەیا پرۆتینێ CA 15-3 د شیاندایە بلندتر لێ بهێت ژ رێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ل دەمێ هەبوونا گرێیێن پەنجەشێرێ هەروەسا ل دەمێ هەبوونا گرێیان، بەلێ نە یێن پەنجەشێرێ، پترییا جاران رێژەیا پرۆتینی ل دەمێ هەبوونا پەنجەشێرا سینگی بلند دبیت.

- ب شێوەیەکێ گشتی بلندبوونا رێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ ژ رێژەیا ئاسایی ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا زێدەتر ژ جۆرەکێ پەنجەشێرێ د ناڤ لەشیدا، رێژەیا پشکنینێ گەلەك بلند دبیت ل دەمێ پەنجەشێرا سینگی دهێتە ڤەگوهاستن ژ بۆ هەستییان یان جگەرێ یان هەردوویان پێکڤە.

- ئەگەر ئەنجامێ پشکنینێ بەرەڤ کێمبوونێڤە بیت ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا کارتێکرنەکا باش یا دەرمانێن ژ لایێ نۆژدارا تایبەتمەندڤە هاتینە دان ژ بۆ نەخۆشی.

- ئەگەر ئەنجامێ پشکنینێ پتر بەرەڤ بلندبوونێڤە بیت ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا کارتێکرنەکا نەباش یا دەرمانێن ژ لایێ نۆژدارا تایبەتمەندڤە هاتینە دان یان ژی ئاماژە بیت ژ بۆ دووبارە سەرهلدانا خانەیێن پەنجەشێرێ.

- رێژەیا ئەنجامێ پشکنینا پرۆتینێ CA 15-3 دبیت بلندتر لێ بهێت ژ رێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ل دەمێ هەبوونا پەنجەشێرا سیهان یان پەنکریاس، پرۆستات، هێلکەدانێ، بەلێ ب شێوەیێ هەبوونا پەنجەشێرا سینگی رێژەیا وێ بلند نابیت.

- ل دەمێ هەبوونا گرێیان بەلێ نە یێن پەنجەشێرێ ژی ئەگەرێ بلندبوونا رێژەیا پرۆتینێ CA 15-3 یێ هەی.



پشکنینا پەنجەشێرا سینگی ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Cancer Antigen 15-3 Test
- CA 15-3 Test
- CA15-3
- CA15-3 Breast
- Tumor Breast Test
- Breast Cancer Test



## پشکنینا پەنجەشێرا پەنکریاسێ CA 19-9 Test

مفا ژ پشکنینا پەنجەشێرا پەنکریاسێ CA 19-9 دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڕێژەیا پرۆتینێ CA 19-9 د ناڤ خوینێدا، پرۆتینێ CA 19-9 ژ نیشانکەرێن گرێیان(دلالات الورم) دهێنە هژمارتن، نیشانکەرێن گرێیان چنە؟ نیشانکەرێن گرێیان دهێنە دەردان ژ لایێ خانەیێن پەنجەشێرێڤە یان ژ لایێ خانەیێن ئاساییڤە وەک بەرسڤدانەک دژی هەبوونا پەنجەشێرێ د ناڤ لەشیدا، ل دەڤ کەسێن تەندرۆست و ئاسایی ڕێژەیا پرۆتینێ CA 19-9 زۆر یا کێمە و ب ئاسایی دهێتە هژمارتن، بەلێ ل دەمێ بلندبوونا ڕێژەیا پرۆتینێ CA 19-9 د ناڤ خوینێدا زێدەتر بیت ژ ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئاماژە (بەلێ مەرج نینە) یە ژ بۆ هەبوون و تووشبوون ب پەنجەشێرا پەنکریاسێ، بەلێ هندەک جاران بلندبوونا ڕێژەیا پرۆتینێ CA 19-9 دبیت ئاماژە بیت ژ بۆ هندەک نەخوشییێن دیتر یێن نەپەنجەشێری وەکی بەرکێ زراڤێ یان هەوکرنا جگەرێ و...هتد.

ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا پرۆتینێ CA 19-9:

- کێمتر بیت ژ: 19 U/ml>



## بۆچی پشکنینا پرۆتینێ CA 19-9 دهێتە ئەنجامدان؟

1. ژ بۆ چاڤدێریکرنا پەنجەشێرا پەنکریاسێ و پرۆسێسا چارەسەرییێ.
2. زۆر جاران رێژەیا پرۆتینێ CA 19-9 دگەل بەلاڤبوونا پەنجەشێرێ بلند دبیت.
3. ل دەمێ بچویکبوونا گرێیان رێژەیا پرۆتینێ CA 19-9 کێم دبیت.
4. ژ بۆ پشتراستبوون ژ نەمانا پەنجەشێرێ و دووبارە سەرهلدانا وێ.
5. پتریا جاران دگەل پشکنینێن دیتر پێکڤە دهێنە ئەنجامدان ژ بۆ زانین و دەستنیشانکرنا پەنجەشێرێ.

## کەنگی پێدڤییە پشکنینا پرۆتینێ CA 19-9 بهێتە ئەنجامدان؟

1. دێ پێدڤی ب پشکنینا پرۆتینێ CA 19-9 بی ل دەمێ هەبوونا پەنجەشێرا پەنکریاسێ و پەنجەشێرێن دیتر یێن پەیوەندی ب بلندبوونا رێژەیا پرۆتینێ CA 19-9 هەبیت.
2. ل دەمێ هەبوونا پەنجەشێرێ ژ بۆ زانین و چاڤدێریکرنا ئاست و رێژەیا پەنجەشێرێ.
3. ژ بۆ زانینا کاریگەرییێن چارەسەرییێ یێن هاتینەدان ب نەخوشی ژ لایێ نۆژدارێ تایبەتمەندڤە.
4. پشتی نەمانا پەنجەشێرێ ژ بۆ پشتراستبوون ژ نەمانا پەنجەشێرێ و دووبارە سەرهلدانا وێ.
5. ل دەمێ هەبوونا مێژوویا خێزانێ دگەل پەنجەشێرێ و ب تایبەتی پەنجەشێرا پەنکریاسێ.



**جۆرێن پەنجەشێرێ یێن ئەگەرێ بلندبوونا رێژەیا پرۆتینێ CA 19-9 هەی ژوان....**

1. پەنجەشێرا پەنکریاسێ (ب پلە ئێک).
2. پەنجەشێرا چەناڵێ بایڵ.
3. پەنجەشێرا قولونێ.
4. پەنجەشێرا گەدەی.

**هندەک ژ بارودۆخێن تەندرۆستی یێن نە پەنجەشێری یێن د بنە ئەگەرێ بلندبوونا رێژەیا پرۆتینێ CA 19-9 ژوان....**

1. هەوکرنا پەنکریاسێ.
2. گرتنا چەناڵێ بایڵ.
3. نەخوشییێن گرێدایی جگەرێ.
4. کیسێن ریشالی.



## ڕامانا ئەنجامێن پشکنینا پرۆتینێ CA 19-9:

- ل دەمێ هەبوون و تووشبوون ب پەنجەشێرێ و وەرگرتن و ب کارهینانا چارەسەرییان ژ لایێ نەخوشیڤە ل ژێر ڕاوێژ و چاڤدێرییا نۆژدارێن تایبەتمەندڤە، دبیت پشکنین ماوە ماوە بهێتە ئەنجامدان.

- ئەنجامێ پشکنینێ ل دەمێ هەبوونا پەنجەشێرێ....



1. ڕێژەیا پرۆتینێ CA 19-9 بەرەف بلندبوونێیە: دبیت ب ڕامانا گەشەکرنا گرێیێ یان دروست کارنەکرنا چارەسەرییانە یێن ب نەخوشی هاتینەدان ل ژێر ڕاوێژ و چاڤدێرییا نۆژدارێن تایبەتمەندڤە.
2. ڕێژەیا پرۆتینێ CA 19-9 بەرەف کێمبوونێیە: دبیت ب ڕامانا بچویکبوونا گرێیێ و دروست کارکرنا چارەسەرییانە یێن ب نەخوشی هاتینەدان ل ژێر ڕاوێژ و چاڤدێرییا نۆژدارێن تایبەتمەندڤە.
3. ڕێژەیا پرۆتینێ CA 19-9 ب جێگیری مایە(نە بلند نە کێم بوویە): ب ڕامانا نەخوشی ب جێگیری مایە( تا ڕاددەیەکی یا هاتییە کۆنترولکرن).
4. ڕێژەیا پرۆتینێ CA 19-9 کێم ب بۆ پاشان پشتی دووبارە پشکنینکرنێ دووبارە بلندبوویە: دبیت ب ڕامانا گوهۆڕین و ڤەگەڕیانا پەنجەشێرێ بیت پشتی وەرگرتنا چارەسەرییێ.

- ل دەمێ نەبوونا پەنجەشێرێ و ڕێژەیا پرۆتینێ CA 19-9 بلندتربیت ژ ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ، هندەک بارودۆخێن تەندرۆستی یێن نە پەنجەشێری یێن د بنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا پرۆتینێ CA 19-9 ژوان....

1. هەوکرنا پەنکریاسێ.
2. گرتنا چەناڵێ بایڵ.
3. نەخوشییێن گرێدایی جگەرێ.
4. کیسێن ڕیشالی.

پشکنینا پرۆتینێ CA 19-9 ب ڤان شێوازان دهێته نڤیسین:

- CA 19-9 Blood Test
- CA 19-9 Test
- CA 19-9
- CA 19-9 Liver
- Cancer Antigen 19-9 Test
- Carbohydrate Antigen 19-9 Test



## پشکنینا AFP - Alpha Fetoprotein Tumor Marker Test

ئەلفا فیتۆ پرۆتین AFP، پرۆتینەکە دهێتە دەردان ژلایێ جگەرێڤە ژ بۆ گەشەکرنا زارۆکی د زکێ ئافرەتا دووگیاندا، رێژەیا پرۆتینێ AFP هەردەم یا بلندە ل دەمێ ژ دایکبوونا زارۆکیدا، بەلێ هەتا دگەهیتە ژییێ ئێک سالییێدا ب شێوەیەکێ بەرچاڤ رێژەیا پرۆتینێ ئەلفا فیتۆ پرۆتین بەرەڤ نزمبوونێڤە دچیت، ل دەڤ کەسەکێ تەندرۆست و بێی هەبوونا ئاریشەیێن تەندرۆستی پێدڤییە رێژەیا پرۆتینی زۆر یا کێم بیت. د شیاندایە ب رێکا پشکنینا AFP Tumor Marker رێژەیا پرۆتینێ ئەلفا فیتۆ پرۆتین دناڤ خوینێدا دەستنیشان بکەین ل دەڤ پێگەهشتییان، نیشانکەرێن گرێیان Tumor markers دهێنە بەرهەمهینان ژ لایێ خانەیێن پەنجەشێرێ یان خانەیێن ئاسایی یێن لەشی ژ بۆ بەرسڤدانەک ژ بۆ پەنجەشێرێ دناڤ لەشیدا.

رێژەیا ئاسایی یا پشکنینا AFP:

ل دەڤ پێگەهشتییان

- 10 - 20 ng/mL



دبیت بلندبوونا ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینا پرۆتینێ ئەلفا فیتۆ ژ ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئاماژە بیت ژ بۆ هەبوونا پەنجەشێرا جگەرێ یان پەنجەشێرا هێلکەدانێ و گۆنان، و هەروەسا نەخۆشییێن دیتر یێن گرێدایی جگەرێ نەک پەنجەشێرا جگەرێ وەکی Cirrhosis , Hepatitis ، مەرج نینە هەردەم بلندبوونا ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینا پرۆتینێ ئەلفا فیتۆ ژ ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئاماژە بیت ژ بۆ پەنجەشێرێ، هەر ژبەر هندێ پشکنینا AFP ب تنێ پشت پێ ناهێتە بەستن ژ بۆ زانین و دەستنیشانکرنا دروست یا پەنجەشێرێ، بەلێ دشیانێن پشکنینێدا هەیە ببیتە هاریکارەکا باش ژ بۆ دەستنیشانکرنا نەخۆشییێ دەمێ دگەل هندەک پشکنینێن دیتر پێکڤە دهێتە ئەنجامدان، و هەروەسا پشکنینا پرۆتینێ ئەلفا فیتۆ دهێتە ئەنجامدان و داخوازکرن ژلایێ نۆژدارێن تایبەتمەندڤە ژ بۆ زانین و کاریگەرییا چارەسەرییێن ب نەخۆشی هاتینەدان ژ بۆ پەنجەشیرێ ئەرێ بەرسڤەدانەکا باش لەشێ نەخۆشی ژ بۆ دەرمانان هەبوویە یان ژیک نە و هەروەسا هندەک جاران ژ بۆ پشتراستبوون ژ دووبارە سەرهلنەدانا پەنجەشێرێ پشکنین دووبارە دهێتە ئەنجامدان.

## بۆچی پێدڤییە پشکنینا ئەلفا فیتۆ پرۆتین بهێتە ئەنجامدان؟

1. ژ بۆ پشتراستبوون و دەستنیشانکرنا پەنجەشێرا جگەرێ، پەنجەشێرا هێلکەدانێ و گۆنان.
2. ژ بۆ چاڤدێریکرنا چارەسەرییێن ژ بۆ پەنجەشێرێ ب نەخۆشی دهێنەدان ل ژێر چاڤدێری و ڕاوێژا نۆژدارێن تایبەتمەندڤە. ل دەمێ بلندبوونا ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ ژ ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ب ڕامانا بەلاڤبوونا پەنجەشێرێیە، هەروەسا ل دەمێ کێمبوونا ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ ژ ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ب ڕامانا بەرسڤدانەکا باش یا لەشێ نەخۆشییە ژ بۆ دەرمانێن ژ لایێ نۆژدارێن تایبەتمەندڤە پێ هاتینەدان.
3. ژ بۆ چاڤدێریکرن و پشتراستبوون ژ دووبارە سەرهلنەدانا پەنجەشێرێ پشتی چارەسەرییێن ب نەخۆشی هاتینەدان و نەمانا پەنجەشێرێ.
4. ژ بۆ چاڤدێریکرنا تەندرۆستییا نەخۆشێن ئاریشەیێن دیتر یێن گرێدایی جگەرێ هەین وەکی Cirrhosis - Hepatitis

## کەنگی پێدڤیە پشکنینا ئەلفا فیتۆ پرۆتین بهێتە ئەنجامدان؟

1. دێ پێدڤی ب پشکنینا AFP بی ل دەمێ کرنا پشکنینێن فیزیکی و پشکنینێن دیتر بۆ نەخۆشی ژ لایێ نۆژدارێ تایبەتمەندڤە و دیاربوون و پێشبینیا هەر ئێک ژ پەنجەشێرێن جگەر و هێلکەدان و گۆنان.
2. دێ پێدڤی ب پشکنینا AFP بی ل دەمێ وەرگرتنا چارەسەرییان ل ژێر چاڤدێری و راوێژا نۆژدارێن تایبەتمەندڤە ژ بۆ زانینا کاریگەرییا دەرمانان ل سەر نەخۆشی.
3. پشتی نەمانا پەنجەشێرێ ژ بۆ پشتراستبوون ژ دووبارە سەرهلنەدانا پەنجەشێرێ
4. پشکنینا ئەلفا فیتۆ پرۆتین هاریکارە ژ بۆ ئاگەهداربوون ژ بەرسڤدانا لەشێ نەخۆشی ژ بۆ چارەسەرییان یێن ب نەخۆشی هاتینەدان.
5. هەروەسا پشتراستبوون ژ دووبارە زڤرینا نەخۆشییێ.




## رامانا ئەنجامێن پشکنینا ئەلفا فیتۆ پرۆتین:

- ل دەمێ بلندبوونا رێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ ژ رێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ پشتراستبوون ژ هەبوونا خانەیێن پەنجەشێرێ د جگەر و هێلکەدان و گۆناندا، هەروەسا هندەک جاران بلندبوونا رێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ هندەک نەخۆشییێن دیتر وەکی Hodgkin Disease ، lymphoma یان هەبوونا گرێیان بەلێ نە یێن پەنجەشێرێ د جگەرێدا.

- ل دەمێ وەرگرتنا چارەسەرییێن پەنجەشێرێ و ئەنجامدانا پشکنینێ:

1. ئەگەر رێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ بلندتر بوو ژ رێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ..

- ئانکو پەنجەشێر بەلاڤبوویە یان ژیک چارەسەرییێن ب نەخۆشی هاتینەدان کاریگەرییەکا باش نەبوویە ل سەر لەشێ نەخۆشی.

2. ئەگەر رێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ کێمتر بوو ژ رێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ..

- ئانکو چارەسەرییێن ب نەخۆشی هاتینەدان کاریگەرییەکا باش هەبوویە ل سەر لەشێ نەخۆشی.

3. ئەگەر رێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ نە بلندتر نە ژیک کێمتر لێ هاتبیت ژ رێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ..

- ئاماژەیە ژ بۆ هندێ نەخۆشی ب جێگیری مایە.

4. ئەگەر رێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ کێم بوو پاشی بلندتر لێ هات ژ رێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ..

- ئاماژەیە ژ بۆ هندێ دووبارە نەخۆشییێ سەرهلدایە.



## پشکنینا پرۆتینیێ AFP ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- AFP
- total AFP
- AFP Test
- TAFP
- Alpha Fetoprotein (AFP) Tumor Marker Test
- alpha-fetoprotein-L3 Percent



## پشکنینا Carcinoembryonic Antigen Test - CEA

پشـــکنینا Carcinoembryonic Antigen (CEA) دهێته بکارهینان و مفا ژێ دهێته وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ژمارەیەکا جۆرێن پەنجەشێرێ، هەروەسا ب ڕێژەیەکا زۆر مفا ژ پشـکنینا CEA دهێته وەرگرتن ژ بۆ دەسـتنیشانکرنا پەنجەشێرا ڕێڤیکێن مەزن و ئەندامێ پشـتێ (کۆمێ، المسـتقیم، Rectal)، هەروەسـا مفا ژ پشـکنینێ دهێته وەرگرتن ژ بۆ زانینا کارتێکرنا دەرمانێن ژ لایێ نەخۆشیڤە هاتینە بکارهینان.

CE Antigen مادەیەکە ژ لایێ خانەیێن پەنجەشـێرێڤە دهێنە بەرهەمهینان و درێژنە د ناڤ زڤڕۆکا خوینێدا، پشکنینا CEA ڕێژەیا Carcinoembryonic Antigen ددەتە دیارکرن د ناڤ خوینێدا، ل دەمێ کەسـەک جگارەیان بکێشـیت د شـیاندایە ببیتە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا CEA د ناڤ لەشـیدا، ژ بەر هندێ ئەگەر تو ژ وان کەسان بی یێن جگارەیان بکێشی نۆژدارێ خۆ ئاگەهدار بکە.

ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا CEA:

- 0 - 2.5 ng/mL (0 - 2.5 µg/L)
- ژ بۆ کەسـێن جگارکێش هەتا ڕێژەیا (0 - 5 µg/L) 0 - 5 ng/mL ب ئاسـایی دهێته هژمارتن.



بلنـدبوونـا ڕێژەیـا Carcinoembryonic Antigen (CEA) دهێتە دیتن د گەلەك جۆرێن پەنجەشێرێدا ژ وان:

1. پەنجەشێرا قۆلۆنێ.
2. پەنجەشێرا ڕژێنا پەریزاد (سرطان الغدة الدرقية).
3. پەنجەشێرا سینگی.
4. پەنجەشێرا هێلکەدانێ.
5. پەنجەشێرا سیهان.
6. پەنجەشێرا جگەرێ.
7. پەنجەشێرا پرۆستاتێ.
8. پەنجەشێرا پەنکریاسێ.
9. پەنجەشێرا کۆئەندامێ هەرسێ.



## ڕامانا ئەنجامێن پشکنینا Carcinoembryonic Antigen (CEA):

بلندبوونا ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ ژ ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا جۆرێن جودا ژ پەنجەشێرێ ژ بەر کو بلندبوونا ڕێژەیا Carcinoembryonic Antigen (CEA) دهێتە دیتن د گەلەك جۆرێن پەنجەشێرێدا، بەلێ مەرج نینە هەر بلندبوونەك د ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا CEA دا پەیدا ببیت ئاماژە بیت ژ بۆ پەنجەشێرێ ژ بەر کو هندەك ئەگەرێن دیتر ژی هەنە دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا پشکنینێ وەکی:

1. هەوکرن.
2. هەوکرنا بهێز یا جگەرێ.
3. هەبوونا نەخۆشییێن گرێدایی هەوکرنا ڕێڤیکان.
4. جگارەکێشان.

## پشکنینا Carcinoembryonic Antigen ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Carcinoembryonic Antigen Test
- CEA Test
- CEA

## پشکنینا پرۆستاتان Prostate-Specific Antigen (PSA) Test

مفا ژ پشکنینا پرۆستاتان دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڕێژەیا پڕۆتینێ Prostate-Specific Antigen د ناڤ خوینێدا، پرۆستات چییە؟ پرۆستات ڕژێنەکا بچویکە ل دەڤ ڕەگەزێ نێر (ڕژێنا پرۆستات ل دەڤ ڕەگەزێ مێ هەبوون نینە) و وەک بەشەك ژ کۆئەندامێ زاوزێ د زەلاماندا دهێتە هژمارتن دکەڤیتە بەشێ خوارێ یێ میزلدانێ، کارێ سەرەکی یێ ڕژێنا پرۆستات دەردانا شلەیەکێیە دبیتە بەشەك ژ تۆڤی، پڕۆتینێ PSA ژ لایێ پرۆستاتێڤە دهێتە دروستکرن و بەشەکێ زۆر دچیتە د ناڤ تۆڤیدا و ڕێژەیەکا کێم ژێ دچیتە د ناڤ زڤڕۆکا خوینێدا ب شێوەیەکێ سرۆشتی ڕێژەیەکا کێم ژ پڕۆتینێ PSA د ناڤ خوینێدا ل دەڤ ڕەگەزێ نێر هەیە و ب ئاسایی دهێتە هژمارتن، بلندبوونا ڕێژەیا پڕۆتینێ PSA د ناڤ خوینێدا ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا ئاریشەیان د کارێ ڕژێنا پرۆستاتێدا و هندەك جاران ئاماژەیە ژ بۆ سەرهلدانا خانەیێن پەنجەشێرا پرۆستاتان، پەنجەشێرا پرۆستاتان ب بەربەلاڤترین جۆرێن پەنجەشێرێ دهێتە هژمارتن ل دەڤ ڕەگەزێ نێر، هەر ژ بەر هندێ ژ بۆ دەستنیشانکرنا دەستپێکا پەنجەشێرا پرۆستاتێ پشت ب پشکنینا پڕۆتینێ Prostate-Specific Antigen (PSA) دهێتە بەستن.



ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا پڕۆتینێ PSA:

| تەمەن | ڕێژەیێن ئاسایی | یەکە |
|---|---|---|
| ژییێ 40 هەتا 50 سالییێ | 0.1-2.19 | ng/ml |
| ژییێ 51 هەتا 61 سالییێ | 0.27-3.42 | ng/ml |
| ژییێ 61 هەتا 70 سالییێ | 0.22-6.16 | ng/ml |
| ژییێ 71 هەتا 79 سالییێ | 0.21-6.77 | ng/ml |
| ژییێ 80 سالییێ و زێدەتر | کێمتر بیت ژ 7.2 > | ng/ml |

پڕۆتینێ Prostate-Specific Antigen ب دوو شێوەیان هەیە د ناڤ خوینێدا:

1. ب شێوەیێ سەربەست Free PSA
2. ب شێوەیێ بەندکری ب پڕۆتینەکێ دیترڤە cPSA

هەر ژ بەر هندێ دوو پشکنینێن تاقیگەهێ یێن ژ بۆ پشکنینکرنا پرۆستاتان هەین:

1. Total PSA: ڕێژەیا سەرجەمێ پڕۆتینێ PSA د ناڤ خوینێدا ددەتە دیارکرن، کۆیێ هەردوو Free PSA و cPSA ب خۆڤە دگریت.
2. Free PSA: ڕێژەیا بەشێ سەربەست د ناڤ خوینێدا ددەتە دیارکرن.



### بۆچی پێدڤییە پشکنینا پرۆتینێ PSA بهێتە ئەنجامدان:

پشکنینا PSA ب مەبەستا چاڤدێریکرن و دەستنیشانکرنا هەبوونا ئاریشەیێن د رژێنا پرۆستاتێدا دهێتە ئەنجامدان، ژ بەربەلاڤترین جۆرێن پەنجەشێرێ ل دەڤ رەگەزێ نێر پەنجەشێرا پرۆستاتانە، پشکنینا PSA هاریکارە ژ بۆ ئاگەهداربوون ژ تەندرۆستبوونا رژێنا پرۆستاتێ و دەستنیشانکرنا دەستپێکا هەبوون یان نەبوونا پەنجەشێرا پرۆستاتێ، ژ بەری دەرکەڤتنا نیشان و گەشەکرنا وێ، پاشان ب ئەنجامدانا پشکنینێ ب رێکا Biopsy پشتراستبوون ژ دروستییا ئەنجامێ پشکنینێ دهێتە کرن.




### کەنگی پێدڤییە پشکنینا پرۆتینێ PSA بهێتە ئەنجامدان:

- ل دەمێ دەرکەڤتنا نیشان و هەبوونا ئاریشەیان د رژێنا پرۆستاتێدا.

### نیشانێن هەبوونا ئاریشەیێن تەندرۆستی د رژێنا پرۆستاتدا:

1. هەبوونا ئێشانێ ل دەمێ میزکرنێ و هەستکرن ب نەئارامییێ ل دەمێ میزکرنێ.
2. هەبوونا خوینێ ل گەل میز یان سپێرمان.
3. هەبوونا ئێشانێ د ناوچەیا حەوزێدا.
4. راوەستیان و بەردەوامکرنا میزکرنێ(چبك چبك میزکرن).

- ل دەمێ وەرگرتنا چارەسەرییێ ژ بۆ نەخۆشێن نەخۆشییێن پرۆستاتان و ب تایبەت پەنجەشێرا پرۆستاتێ هەی، ژ بۆ چاڤدێریکرن و ئاگەهداربوون ژ کارتێکرنا چارەسەرییێ پشکنینا Total PSA بۆ ماوە ماوە دهێتە ئەنجامدان هەتا پشتی چاکبوونێ ژی ژ بۆ چاڤدێریکرن و ئاگەهداربوون ژ مەترسییا دووبارە سەرهلدانێ.

- ل دەمێ هەبوونا هەوکرنان د میزلدان و میزەڕووییدا دبیت پشکنینا PSA ژ لایێ نۆژدارێ تایبەتمەندڤە بهێتە داخوازکرن ژ بۆ پشتڕاستبوون ژ تەندروستبوونا ڕژێنا پرۆستاتێ.

- ل دەمێ بلندبوونا تەمەنی و ب تایبەت پشتی تەمەنێ 40 سالییێ پێدڤییە سالانە پشکنینا PSA ژ لایێ ڕەگەزێ نێرڤە بهێتە ئەنجامدان ژ بۆ ئاگەهداربوون و دەستنیشانکرنا پێشوەخت یا هەبوونا ئاریشەیێن گرێدایی ڕژێنا پرۆستاتێ و ب تایبەت پەنجەشێرا پرۆستاتێ، ژ بەر کو ل گەل بلندبوونا تەمەنی ئەگەرێ سەرهلدانا پەنجەشێرا پروستاتان زۆرە و ب بەربەلاڤترین جۆرێن پەنجەشێرێ دهێتە دانان ل دەڤ ڕەگەزێ نێر.

- ل دەڤ ئەو کەسێن مێژوویا خێزانێ ل گەل نەخۆشییێن پرۆستاتان هەی مەترسییا تووشبوونێ ب ئاریشەیێن ڕژێنا پرۆستات و پەنجەشێرا پرۆستاتێ زێدەترە.

- بێ هەبوونا چ نیشان یان ئاریشەیێن تەندروستی پێدڤییە پشکنینا پڕۆتینێ PSA پشتی تەمەنێ 40 سالییێ سالانە بهێتە ئەنجامدان ژ بۆ دەستنیشانکرنا پێشوەخت یا هەر ئاریشەکا تەندروستی د ڕژێنا پرۆستاتدا.

ڕامانا ئەنجامێن پشکنینا پرۆستاتان Prostate-Specific Antigen:

- کێمبوونا ڕێژەیا پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ ئاساییبوون و تەندروستبوونا کارێ ڕژێنا پرۆستات.

- بلندبوونا ڕێژەیا PSA د ناڤ خوینێدا ب ئاسایی دهێتە هژمارتن ل گەل بلندبوونا تەمەنی، بەلێ بلندبوونەکا زێدەتر ژ یا پێدڤی ئاماژەیەکا بهێزە ژ بۆ تێکچوونا کارێ ڕژێنا پرۆستات.

- هەبوونا پەنجەشێرا پرۆستاتێ ژ بەربەلاڤترین جۆرێ پەنجەشێرێ ل دەڤ زەلامان دهێتە هژمارتن، ئەو کەسێن مەترسییا تووشبوونێ ل دەڤ هەی ب پەنجەشێرا پرۆستاتان ب گشتی ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینا PSA ژ 10.0 ng/ml< زێدەترە.

- هەبوونا هەوکرنان د ڕژێنا پرۆستاتێدا Prostatitis، دبیتە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا پرۆتینێ PSA بەلێ ب ڕێژەیەکا کێم.

- ل دەمێ زێدەکارکرنا پرۆستاتان یان ل دەمێ مەزنبوونا وان ڕێژەیا PSA د ناڤ خوینێدا زێدە دبیت.




پشکنینا پرۆتینێ PSA ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Prostate-Specific Antigen Test
- PSA Test
- Total PSA
- Free PSA

## پشکنینا Beta 2 Microglobulin Tumor Marker Test - B2M

مفا ژ پشـــکنینا B2M دهێته وەرگرتن ژ بۆ دەســـتنیشـــانکرنا ڕێژەیا پڕۆتینێ Beta-2 Microglobulin (B2M) د ناڤ خوینێ یان میزێ یان Cerebrospinal Fluid (CSF) دا ، CSF چییە؟ شـــلەیەکێ بێڕەنگ و ڕۆنە، د ناڤ مێشـــک و بڕبرا پشـــتێدا هەبوون یا هەی. پڕۆتینێ B2M دهێنە دیتن ل سەر ڕیژەیەکا زۆر ژ خانەیان، مرۆڤەکێ تەندرۆست ڕێژەیەکا کێم ژ پڕۆتینێ B2M یـا هەی د نـاڤ خوینێ و میزێدا و ب ئاســـایی دهێتە هژمارتن، ئەو مرۆڤێن پەنجەشـــێرا خوینێ و مەژییێ هەســـتی هەین ڕێژەیا B2M د ناڤ خوین و میزا ئەوان کەســـانـدا یـا بلنـدە وەکی پەنجەشـــێرێن Multiple Myeloma, Lymphoma, Leukemia ، بلنـدبوونـا ڕێژەیـا پڕۆتینێ B2M د نـاڤ Cerebrospinal Fluid (CSF) دا ئاماژەیە ژ بۆ بەلاڤبوونا پەنجەشـێرێ د ناڤ مێشـکی یان سـترییەبەندکێدا(سـترییەبەندک : Spinal Cord).

B2M

ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا B2M:

د ناڤ خوینێدا:

- 0.70 - 1.80 mcg/mL

د ناڤ میزێدا:

- ≤300 mcg/L

د ناڤ CSF دا:

- 0 - 2.4 mg/L

پشــکنینا Beta-2 Microglobulin هەردەم ژ بۆ نەخۆشــێن پەنجەشــێر هەی ناهێتە بکارهینان، بەلکی هندەك جاران دهێتە بکارهینان و مفا ژێ دهێتە وەرگرتن ژ بۆ:

1. پشکنینکرنا ئەوان نەخۆشێن ئاریشەیێن گرێدایی گولچیسکان هەین.
2. هەوکرنێن ڤایرۆسی وەکی ڤایرۆسێ HIV
3. نەساخییێن دۆمدرێژ یێن کارتێکرنێ ل مێشك و سترییەبەندکێ دکەن.

رامانا ئەنجامێن پشکنینا Beta 2 Microglobulin (B2M):

ل دەمێ هەبوونا پەنجەشێرێ:

- ئەگەر رێژەیا ئەنجامێ پشــکنینا B2M بلندتر بوو ژ رێژەیا ئاســایی ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا پەنجەشـێرێ و بەلاڤبوونا وێ، هەروەسا ئاماژەیە ژ بو هندێ چارەسەرییێن ژ بۆ پەنجەشێرێ هاتینە بکارهینان کاتێکرنەکا نەباش هەبوویە.
- ئەگەر رێژەیا ئەنجامێ پشکنینا B2M کێم ببیت ئاماژەیە ژ بۆ هندێ چارەسەرییێن ژ بۆ پەنجەشێرێ هاتینە بکارهینان کارتێکرنەکا باش هەبوویە.
- ئەگەر رێژەیا ئەنجامێ پشــکنینا B2M وەکی خۆ بمینیت (ب جێگێری بمینیت) ئانکو نە بلندتر نە کێمتر بیت ژ رێژەیا بەری هینگێ ئاماژەیە ژ بۆ هندێ نەخۆشی وەك خۆ مایە زێدەتر بەلاڤنەبوویە د ناڤ لەشیدا.
- ئەگەر رێژەیا ئەنجامێ پشکنینا B2M کێم ببیت پشتی وەرگرتنا چارەسەرییێ و پاشی دووبارە رێژەیا وێ بلند ببیت ئاماژەیە ژ بۆ هندێ پەنجەشێرێ دووبارە سەرهلدایە.

پشکنینا B2M ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Beta 2 Microglobulin Test
- Beta 2 Microglobulin Tumor Marker Test
- B2M Test
- Total Beta-2 Microglobulin Test
- β2-microglobulin Test

**Dep. Hormones Test**

## پشکنینێن هۆرمۆنێن ڕژێنا پەریزاد (الغدة الدرقية - Thyroid Gland)

**Thyroid Stimulating Hormone (TSH) Test**

**Triidothyronine (T3) Test**

**Thyroxine (T4) Test**

ڕژێنا پەریزاد ڕژێنەکا بچویکە ژ دوو بەشـــان پێکـدهێت و ب ڕێکا ناڤبرەکێ پێکڤە گرێداینە قەبارەیێ وێ ب تنێ نێزیکی 5 سانتیمەترانە و کێشا وێ نێزیکی 25 - 20 گم د مرۆڤێن پێگەهشتیدا، ل دەمێ دووگیانبوون و زڤرۆکا هەیڤانە ل دەڤ ژنان ڕژێنا پەریزاد ژ قەبارەیێ خۆ مەزنتر لێدهێت، یۆدێ ژ لایێ خوارنێڤە دهێتە وەرگرتن ڕژێنا پەریزاد مفایی ژێ وەردگریت، ڕژێنا پەریزاد هەمی (T4) Thyroxine و ڕێژەیەکا کێم ژ (T3) Triidothyronine دەردەدەت، هەروەسان هۆرمۆنێ کالسیتوونین دەردەدەت (پشکنینا هۆرمۆنێ کالسیتوونین د لاپەڕێن داهاتیدا ب شێوەیەکێ تێر و تەسەل هاتییە شرۆڤەکرن)، تەمەنێ T4 ب تنێ حەفت ڕۆژن و هەروەسا تەمەنێ T3 ب تنێ نێزیکی 18 دەمژمێرانە.

**ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینێن هۆرمۆنێن ڕژێنا پەریزاد:**

| یەکە | ڕێژەیێن ئاسایی | پشکنین |
|---|---|---|
| nmol/L | 0.3 - 4.2 | TSH |
| nmol/L | 0.92 - 2.33 | T3 |
| nmol/L | 60 - 138 | T4 |



**هندەك ژكارێن ڕژێنا پەریزاد د ناڤ لەشیدا ئەنجام ددەت:**

كارێن ڕژێنا پەریزاد (الغدة الدرقية - Thyroid Gland) ژ لایێ هۆرمۆنێ TSH ڤە دهێتە ڕێكئێخستن ل ژێر كونترۆلا ڕژێنا ژێر مێشكیڤە:

1. كارێ ئەندامێن لەشی بلەزتر یان خاڤتر لێ دكەت.
2. ڕێكئێخستنا وەرگرتنا ئۆكسجینێ دكەت و بەرهەمهینانا گەرمییێ.
3. گرنگە ژ بۆ پاراستنا هەڤسەنگییا زڤرۆكا هەیڤانە و شیردانێ ل دەڤ ژنان.
4. پاراستنا هەڤسەنگییا خوێیا د ناڤ لەشیدا دكەت.
5. زێدەكرنا مژینا كاربۆهیدراتان ژ لایێ ڕێڤیكانڤە.
6. هاندانا چێكرنا پرۆتین و كاربۆهیدراتان دكەت.
7. هاریكارە ژ بۆ پێگەهشتنا سیستەمێ مێشك و دەماران.



هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ ڕژێنا پەریزاد Hyperthyroidism د ناڤ لەشیدا:

1. نەخۆشییا Grave ب بەربەلاڤترین هۆکار دهێتە هژمارتن، نەخۆشییەکا سیستەمێ بەرگرییا دژی لەشییە تێدا بەرگرییا لەشی هێرشی ڕژێنا پەریزاد دکەت.
2. هەوکرنا ڕژێنا پەریزاد Thyroiditis
3. هەبوونا گرێیان د ڕژێنا پەریزاد و ڕژێنا ژێرمێشکیدا.
4. زێدەبوونا یۆدی.

نیشانێن بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ ڕژێنا پەریزاد Hyperthyroidism د ناڤ لەشیدا:

1. زێدەبوونا حەزا خوارنێ.
2. هەستکرن ب ماندیبوونێ.
3. تووڕەبوون.
4. خوهدان.
5. نەئاساییبوونا لێدانێن دلی.
6. هەبوونا ئاریشەیان ل دەمێ نڤستنێ.
7. وەریانا پرچێ.
8. زکچوون.
9. هەلاڤێتن.
10. مەزنبوونا قەبارەیێ سینگی ل دەڤ ڕەگەزێ نێر.

نیشانێن کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ ڕژێنا پەریزاد Hypothyroidism د ناڤ لەشیدا:

1. زێدەبوونا کێشا لەشی.
2. هەستکرن ب ماندیبوون و لاوازبوونێ.
3. هەستیاری.
4. هەستکرن ب پەستانێ.
5. هەستکرن ب سەرمایێ.
6. کێمبوونا خوهدانێ.
7. کێمبوونا لێدانێن دلی.
8. بلندبوونا ڕێژەیا کۆلسترۆلی د ناڤ خوینێدا.
9. کێمبوونا بیردانکێ.
10. هەبوونا ئاریشەیان د زڤڕۆکا هەیڤانەدا ل دەڤ ڕەگەزێ مێ.

11. لاوازبوونا ماسۆلکەیان.
12. ڕەقبوونا ماسۆلکەیان.
13. ئێشانا ماسۆلکەیان.
14. ئێشانا گەهان.

ڕامانا ئەنجامێن پشکنینێن گرێدایی هۆرمۆنێن ڕژێنا پەریزاد:

- **Thyroid Stimulating Hormone (TSH) Test**: بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ TSH ب شێوەیەکێ گشتی ئاماژەیە ژ بۆ کێمبوونا هۆرمۆنێن ڕژێنا پەریزاد Hypothyroidism ئانکو ڕژێنا پەریزاد ڕێژەیا هۆرمۆنێن لەش پێدڤی دروست ناکەت و بەردەوام ڕژێنا ژێرمێشکی هۆرمۆنێ TSH دەرددەت، هەروەسان کێمبوونا ڕێژەیا TSH ب شێوەیەکێ گشتی ئاماژەیە ژ بۆ بلندبوونا هۆرمۆنێن ڕژێنا پەریزاد Hyperthyroidism ئانکو ڕژێنا پەریزاد زێدەتر ژ پێدڤییا لەشی هۆرمۆنان دەرددەت و بوویە ئەگەرێ هندێ ڕژێنا ژێرمێشکی ژ دەردانا هۆرمۆنێ TSH ڕاوەستیت.
- **Triidothyronine (T3) Test**: ل دەمێ بلندبوونا ڕێژەیا T3 ب Hyperthyroidism دهێتە نیاسین، هەروەسان ل دەمێ کێمبوونا ڕێژەیا T3 ب Hypothyroidism دهێتە نیاسین، پترییا جاران ئەنجامێ پشکنینێ ل گەل ڕێژەیا هۆرمۆنێن TSH , T4 دهێتە بەراوردکرن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ئاریشەیێن گرێدایی ڕژێنا پەریزاد.
- **Thyroxine (T4) Test**: بلندبوونا ڕێژەیا T4 د ناڤ خوینێدا ئاماژەیە ژ بۆ هندێ زێدەتر ژ یا پێدڤی ڕژێنا پەریزاد کار دکەت و کێمبوونا ڕێژەیا T4 د ناڤ خوینێدا ئاماژەیە ژ بۆ نەدروست دەردانا هۆرمۆنی ژ لایێ ڕژێنا پەریزاد (الغدة الدرقية - Thyroid Gland) ڤە.



## پشکنینێن هۆرمۆنێن گرێدایی ڕژێنا پەریزاد ب ڤان شێوازان دهێنە نڤیسین:

- Thyroid Function Test
- T.F.T
- Thyroid Stimulating Hormone Test
- TSH Test
- Free T4
- Free T3
- FT4
- FT3
- Triidothyronine Test
- T3 Test
- Thyroxine Test
- T4 Test



## پشکنینا کالسیتۆنین Calcitonin Test

مفا ژ پشـــکنینا Calcitonin دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەســـتنیشـــانکرنا ڕێژەیا هۆرمۆنێ کـالســـیتۆنین دنـاڤ خوینێـدا، هۆرمۆنێ کالســـیتۆنین دهێتە دەردان ژ لایێ ڕژێنا پەریزاد (الغـدة الدرقیة - Thyroid Gland)، **ڕژێنا پەریزاد چییە؟** ڕژێنا پەریزاد ڕژێنەکا بچویکە ژ دوو بەشان پێکدهێت و ب ڕێکا ناڤبرەکێ پێکڤە گرێدایینە قەبارەیێ وێ ب تنێ نێزیکی 5 ســـانتیمەترانە و کێشـــا وێ نێزیکی 20 - 25 گم د مرۆڤێن پێگەهشـــتیدا، کالســـیتۆنین هاریکارییا لەشـی دکەت ژ بۆ چاوانییا ب کارهینانا کالسیومی دناڤ لەشـیدا، کالسـیتۆنین ئێکە ژ جورێن نیشـــانکەرێن گرێیان (علامات الورم - Tumor Markers)، **نیشـــانکەرێن گرێیان چنە؟** نیشانکەرێن گرێیان مادەیەکە دهێتە دروستکرن ژ لایێ خانەیێن پەنجەشێرێڤە و هەروەســـا دهێتە دەردان ژلایێ خـانەیێن ئـاســـاییڤە ژی وەکی بەرســـڤدانەک ژ بۆ پەنجەشێرێ دناڤ لەشیدا.




### ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا هۆرمۆنێ Calcitonin:

ڕێژەیا هۆرمۆنی ل دەڤ هەردوو ڕەگەزان وەکی ئێک نینە، ب شێوەیەکێ گشتی پێدڤییە:

| یەکە | ڕێژەیێن ئاسایی | ڕەگەز |
|---|---|---|
| ng/L | کێمتر یان یەکسان بیت ب 19 => | ڕەگەزێ نێر |
| ng/L | کێمتر یەکسان بیت ب 14=> | ڕەگەزێ مێ |

ئەگەر ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینا هۆرمۆنێ Calcitonin بلندتر بوو ژ ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ دبیت ئاماژەبیت ژ بۆ هەبوونا پەنجەشێرێ د ڕژێنا پەریزاد دا و دهێتە نیاسین ب Medullary Thyroid Cancer (MTC)، بلندبوونا ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ دبیت ئاماژە بیت ژ بۆ هەبوونا هندەک ئاریشەیێن دیتر یێن گرێدایی ڕژێنا پەریزاد، پتر مەترسییا تووشبوونێ ب MTC هەیە ل دەمێ هەبوونا....

1. C-cell Hyperplasia: بارودۆخەکە دبیتە ئەگەرێ گەشەکرنەکا نەئاسایی یا خانەیێن گرێدایی ڕژێنا پەریزاد (الغدة الدرقية - Thyroid Gland).
2. Multiple Endocrine Neoplasia type 2 (MEN2): نەخۆشییەکا دەگمەنە و بۆماوەیی یە دبیتە ئەگەرێ گەشەکرنا گرێیان د ڕژێنا پەریزاد و ڕژێنێن دیتر یێن د Endocrine System دا، Endocrine System چییە؟ گرۆپەکێ ڕژێنا ب خۆڤەدگریت، و هەروەسا کۆنترۆلا کارێن گرنگ دناڤ لەشیدا دکەت وەکی چاوانییا ب کارهینان و سوتنا وزێ و ...هتد.




بۆچی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ Calcitonin بهێتە ئەنجامدان؟

1. ژ بۆ دەستنیشانکرنا C-cell Hyperplasia و Medullary Thyroid Cancer (MTC)
2. ژ بۆ چاڤدێریکرنا چارەسەرییێن بۆ MTC هاتینەدان ب نەخۆشی ل ژێر ڕاوێژ و چاڤدێرییا نۆژدارێن تایبەتمەندڤە.
3. ژ بۆ پشتراستبوون ژ دووبارە سەرهلنەدانا MTC پشتی وەرگرتنا چارەسەرییا پێدڤی.
4. ژ بۆ پشکنینکرنا کەسێن مێژوویا خێزانێ دگەل MEN 2 هەی، ل دەمێ تووشبوونێ ب ڤێ نەخۆشییێ دناڤ خێزانێدا مەترسییا تووشبوونێ ب Medullary Thyroid Cancer MTC) زێدەدکەت.

**رامانا ئەنجامێن پشکنینا هۆرمۆنێ Calcitonin:**

1. **ئەگەر ئەنجامێ پشکنینێ بلندتر بوو ژ رێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا C-cell hyperplasia یان Medullary Thyroid Cancer**

2. **ل دەمێ وەرگرتنا چارەسەرییێ ژ بۆ پەنجەشێرا رژێنا پەریزاد و ل دەمێ پشکنینکرنێ دووبارە رێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ بلندتر بوو ژ رێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ هندێ چارەسەرییێن ب نەخۆشی هاتینەدان ژ لایێ نۆژداریڤە کاریگەرییەکا باش نەبوویە.**

3. **پشتی وەرگرتنا چارەسەرییا پێدڤی و نەمانا پەنجەشێرێ و ل دەمێ دووبارە پشکنینکرنێ و هەبوونا رێژەیا بلند یا ئەنجامێ پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ دووبارە سەرهلدان و زڤرینا پەنجەشێرێ.**

4. **بلندبوونا رێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ ژ رێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ دبیت ژ ئەگەرێ هندەک جورێن دیتر یێن پەنجەشێرێ بیت بنە ئەگەرێ بلندبوونا رێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ، وەکی پەنجەشێرا سینگ و سیهان و پەنکریاسێ.**

**تێبینی:**

- **ل دەمێ بلندبوونا رێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ نۆژدار دێ هندەک پشکنینێن دیتر داخواز کەت ژ بۆ پشتراستبوون و دەستنیشانکرنا دروست یا ئاریشێ، وەکی پشکنینێن Thyroid Scan یان Biopsy**

پشکنینا هۆرمۆنێ کالسیتۆنین ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Calcitonin Test
- Calcitonin
- Thyrocalcitonin
- Calcitonin
- CT
- CT Test
- Human Calcitonin
- hCT



## پشکنینا هۆرمۆنێ نێرینە Testestrone Test

مفا ژ پشکنینا Testestrone دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڕێژەیا هۆرمۆنێ نێرینە د ناڤ لەشیدا، هۆرمۆنێ نێرینە ب سێکس هۆرمۆن دهێتە نیاسین بەرپرسە ژ توخمەسیفەتێن دوویەمی یێن نێرینە و مێبینە، ل دەڤ ڕەگەزێ نێر ب تایبەت خانەیێن لایدك د هەردوو گوناندا، هەروەسان ل دەڤ ژنان ژ لایێ هێلکەدانێڤە دهێتە بەرهەمهینان، هەروەسا ڕژێنا ئەدرینال گلاند هۆرمۆنێ نێرینە د هەردوو ڕەگەزاندا دروست دکەت، ڕێژەیا هۆرمۆنێ Testestrone ل دەڤ ڕەگەزێ نێر پترە ب بەراوردکرن ل گەل ڕەگەزێ مێ، هۆرمۆنێ نێرینە کارێن گرنگ د لەشیدا ئەنجام ددەت ژ وان د ڕەگەزێ نێریدا هانا گەشەکرنا کۆئەندامێ زاوزێ ددەت، هاریکارە ژ بۆ گەشەکرن و مەزنبوونا ماسولکەیان و زێدەبوونا موییێن لەشی و گڕبوونا دەنگی د قۆناغا سنێلەبیێدا و هەروەسا زێدەکرنا حەزا سێکسی و ڕۆلی دبینیت د جێگیربوونا بارێ دەروونیدا، د ڕەگەزێ مێدا ژی هاریکارییا هەڤسەنگییا هۆرمۆنان دکەت و ...هتد.

**پشکنینا هۆرمۆنێ نێرینە Testestrone ب دوو شێوەیان دهێتە ئەنجامدان:**

**هۆرمۆنێ Testestrone د لەشیدا ب دوو شێوەیان هەیە ب شێوەیێ ئازاد یان ب شێوەیێ بەندکری ب پرۆتینانڤە.**

1. **Free Testestrone: دەستنیشانکرنا ڕێژەیا بەشێ ئازاد د ناڤ خوینێدا ددەتە دیارکرن.**
2. **Total Testestrone: دەستنیشانکرنا ڕێژەیا هەردوو شێوەیان(ئازاد و بەندکری ب پرۆتینانڤە) ددەتە دیارکرن.**



**ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا هۆرمۆنێ نێرینە:**

ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا هۆرمۆنێ Testestrone ل دویڤ ڕەگەز و ژییێ مرۆڤان گوهۆڕین ب سەردا دهێت، د زارۆکاندا ڕێژەیا هۆرمۆنی یا کێمە پاشان د قۆناغا سنێلەییێدا ڕێژەیا وێ بلند دبیت، پشتی تەمەنێ 45 سالییێ ڕێژەیا هۆرمۆنێ نێرینە بەرەڤ کێمبوونێڤە دچیت.

ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:

| یەکە | ڕێژەیێن ئاسایی | تەمەن |
|---|---|---|
| ng/mL | 0.00 - 0.20 | ژ 1 هەتا 10 سالییێ |
| ng/mL | 0.10 - 5.00 | ژ 10 هەتا 14 سالییێ |
| ng/mL | 1.00 - 9.50 | ژ 14 هەتا 18 سالییێ |
| ng/mL | 2.50 - 9.50 | د نێرەکێ پێگەهشتیدا |

ل دەڤ ڕەگەزێ مێ:

| یەکە | ڕێژەیێن ئاسایی | تەمەن |
|---|---|---|
| ng/mL | 0.00-0.20 | ژ 1 هەتا 10 سالییێ |
| ng/mL | 0.10 – 0.50 | ژ 10 هەتا 14 سالییێ |
| ng/mL | 0.10 – 0.90 | د مێیەکا پێگەهشتیدا |



## کەنگی و بۆچی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ نێرینە بهێتە ئەنجامدان؟

ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:

1. ل دەمێ هەبوونا ئاریشەیێن نەزۆکییێ.
2. ل دەمێ نەمانا حەزا سێکسی.
3. ل دەمێ پێشکەڤتن یان پاشکەڤتنا پێگەهشتنێ (بلوغ - Puberty).
4. ل دەمێ هەبوونا نیشانێن کێمبوون یان بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ Testestrone

ل دەڤ ڕەگەزێ مێ:

1. ل دەمێ هەبوون و دەرکەڤتنا سیفەتێن نێرینە ل دەڤ ژنێ وەك گڕبوونا دەنگی و زۆربوونا موییان.
2. ل دەمێ هەبوونا ئاریشەیان د زڤڕۆکا هەیڤانەدا.
3. ل دەمێ هەبوونا نەزۆکییێ.
4. ل دەمێ گیرۆبوونا دووگیانییێ.
5. ل دەمێ نەمانا حەزا سێکسی.
6. ل دەمێ هەبوونا نیشانێن کێمبوون یان بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ Testestrone



**هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ نێرینە د ناڤ لەشیدا:**

**ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:**

1. هەبوونا گرێیان ب تایبەت د ڕژێنا ئەدرینالدا(دوو ڕژێنێن بچویکن دکەڤنە سەر گولچیسکان).
2. Congenital Adrenal Hyperplasia ل دەڤ زارۆکان و ژ نوی ژدایکبوویان.
3. بکارهینانا دەرمانێن ستیرۆیدی.

**ل دەڤ ڕەگەزێ مێ:**

ب شێوەیەکێ ئاسایی ڕێژەیا هۆرمۆنێ Testestrone ل دەڤ ڕەگەزێ مێ کێمترە ب بەراوردکرن ل گەل ڕەگەزێ نێر...

1. هەبوونا گرێیان د ڕژێنا ئەدرینالدا(دوو ڕژێنێن بچویکن دکەڤنە سەر گولچیسکان).
2. هەبوونا پەنجەشێر یان گرێیان د هێلکەدانێدا.
3. هەبوونا کیسێ هێلکەدانێ.
4. Congenital Adrenocortical Hyperplasia

**هۆکارێن دبنە ئەگەرێ کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ نێرینە د ناڤ لەشیدا:**

**ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:**

1. گیرۆبوونا پێگەهشتنێ (بلوغ - Puberty).
2. نەخۆشییێن دۆمدرێژ Chronic وەکی نەخۆشییا شەکرێ ژ جۆرێ 2 یان تووشبوون ب نەخۆشییا ئایدز، نەخۆشییێن گرێدایی جگەر و گولچیسکان و نەخۆشییێن گرێدایی سیستەمێ بەرگرییا لەشی دژی خۆ.
3. چارەسەرییێن کیمیایی.
4. وەرگرتنا چارەسەرییێ ب ڕێکا تیشکێ.
5. نەخۆشییێن ڤایرۆسی وەک Mumps
6. نەخۆشییێن بۆماوەیی دشێن ببنە ئەگەرێ کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ نێرینە ل دەڤ ڕەگەزێ نێر وەکی Klinefelter, Kallman, Prader-Willi syndromes
7. Hypothalamic or pituitary

هندەك ژ نەخۆشییێن بۆماوەیی ڕاستەوخۆ کارتێکرنێ ل ڕێژەیا هۆرمۆنێ نێرینە دکەن د ناڤ لەشیدا ژ وان:

1. Klinefelter Syndrome
2. Kallmann Syndrome
3. Myotonic Dystrophy

نیشانێن بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ نێرینە د ناڤ لەشیدا:

ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:

1. تووڕەبوون.
2. زێدەبوونا ئاستێ موییان.
3. سەرئێشان.
4. بلندبوونا پەستانا خوینێ Hypertension
5. هەبوونا ئاریشەیێن گرێدایی دل و جگەرێ.
6. نەزۆکی.
7. زێدەبوونا حەزا خوارنێ.
8. زێدەبوونا هێزا سێکسی.
9. مەزنبوونا ڕژێنا پروستات.
10. کێمبوونا ڕێژەیا سپێرمان.
11. خوهدان.
12. وەرمتنا دەست و پێیان.

ل دەڤ ڕەگەزێ مێ:

1. گرِبوونا دەنگی.
2. چەوربوونا پیستی.
3. هەبوونا پرسکان.
4. بچویکبوونا مەمکان.
5. بلندبوونا کێشا لەشی.
6. وەریانا پرچێ.
7. زێدەبوونا موییان ل سەر لەشی ب تایبەت سەروچاڤان.
8. هەبوونا ئاریشەیان د زڤرۆکا هەیڤانەدا.

## نیشانێن کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ نێرینە د ناڤ لەشیدا:

ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:

1. نەمانا حەزا سێکسی.
2. لاوازبوونا هەستییان.
3. هەستکرن ب لاوازییێ و بچویکبوونا ماسۆلکەیان.
4. نەمانا هزروبیران.

ل دەڤ ڕەگەزێ مێ:

1. لاوازبوونا هەستییان.
2. هشکبوونا ئەندامێ زاوزێ.
3. هەبوونا ئاریشەیان ل دەمێ دووگیانییێ.
4. هەبوونا ئاریشەیان د زڤڕۆکا هەیڤانەدا.
5. نەمانا حەزا سێکسی.



## پشکنینا هۆرمۆنێ نێرینە ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Testestrone Test
- Testestrone Hormone Test
- Free Testestrone
- Total Testestrone

## پشکنینا هۆرمۆنێ Luteinizing Hormone Test - LH

پشکنینا LH مفا ژێ دهێته وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڕێژەیا هۆرمۆنێ Luteinizing Hormone د ناڤ خوینێدا، هۆرمۆنێ LH دهێته هژمارتن ژ گرۆپێ سێکس هۆرمۆن و ژ لایێ ڕژێنا ژێرمێشکیڤە دهێته دەردان، ب گرنگ و پێدڤی دهێته زانین ژ بۆ ڕێکئێخستن و گوهۆڕینێن د قۆناغا سێلەیێدا دهێنە ئەنجامدان د هەردوو ڕەگەزاندا و هەروەسا ژ وان پشکنینانە ل دەمێ هەبوونا ئاریشەیێن زڤڕۆکا هەیڤانە و دووگیانبوونێ ل دەڤ ڕەگەزێ مێ پشت پێ دهێتە بەستن ب هەڤپشکی ل گەل کۆمەکا پشکنینێن دیتر وەکی پشکنینێن FSH , Testestrone , Prolactin (هەمی پشکنینێن ئاماژە پێهاتییە کرن هاتینە بەحسکرن و شرۆڤەکرن ب شێوەیەکێ تێر و تەسەل)، هۆرمۆنێ LH ڕۆلەکێ گرنگ یێ هەی د گەشەکرنا کۆئەندامێ زاوزێ و دروستبوونا هێک و سپێرماندا و سیفەتێن جەستەیی د ماوەیێ قۆناغا سێلەیێدا د هەردوو ڕەگەزاندا، هاریکارییا دەردانا هۆرمۆنێ نێرینە Testestrone دکەت ل دەڤ ڕەگەزێ نێر و هەروەسان پشتەڤانییا دەرچوونا هێکا پێگەهشتی ژ هێلکەدانێ ژ بۆ مالبچویکی دکەت ل دەڤ ڕەگەزێ مێ.



## ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا هۆرمۆنێ LH:

ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:

- 1.7 - 8.6 mIU/ml

ل دەڤ ڕەگەزێ مێ:

| یەکە | ڕێژەیێن ئاسایی | بارودۆخ |
|---|---|---|
| mIU/ml | 12.5 | Follicular phase |
| mIU/ml | 14.00 - 95.6 | Ovulate Phase |
| mIU/ml | 11.5 | Luteal Phase |
| mIU/ml | 7.7 - 58.7 | Post Menopause |

## بۆچی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ LH بهێتە ئەنجامدان؟

ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:

1. ژ بۆ دەستنیشانکرنا ئەگەرێن گیرۆبوون و دووگیاننەبوونا خێزانا وی.
2. ژ بۆ دەستنیشانکرنا هۆکارێن کێمبوونا هێزا سێکسی.

ل دەڤ ڕەگەزێ مێ:

1. ژ بۆ دەستنیشانکرنا ئەگەرێن گیرۆبوون و دووگیاننەبوونێ.
2. ژ بۆ دەستنیشانکرنا ئەگەرێن تێکچوونا زڤرۆکا هەیڤانە.
3. ژ بۆ دەستنیشانکرنا ئەگەرێن ڕاوەستیانا زڤرۆکا هەیڤانە ئەگەر ل دەمێ دووگیانبوونێ نەبیت.



## کەنگی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ LH بهێتە ئەنجامدان؟

ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:

1. ل دەمێ هەبوونا نەزۆکییێ.
2. ل دەمێ کێمبوونا ڕێژەیا سپێرمان.
3. ل دەمێ کێمبوونا حەزا سێکسی.
4. ل دەمێ کێمبوونا هێزا سێکسی.
5. ل دەمێ کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ نێرینە Testestrone
6. ل دەمێ لاوازبوونا ماسۆلکەیان.
7. پشتی وەرگرتنا چارەسەرییێ.

ل دەڤ ڕەگەزێ مێ:

1. ل دەمێ هەبوونا نەزۆکییێ.
2. ل دەمێ تێکچوونا زڤڕۆکا هەیڤانە.
3. ل دەمێ چوون د ناڤ تەمەنێ بێئومێدییێدا ب تایبەت ل دەمێ نێزیکبوونا ژنێ ژ ژییێ 45 سالییێ.
4. ل دەمێ ڕاوەستیانا زڤڕۆکا هەیڤانە.
5. هندەك جاران ژ بۆ دیارکرنا زڤڕۆکا هەیڤانە و دەستنیشانکرنا دەمێ دەردانا هێکێ ژ هێلکەدانێ ژ بۆ مالبچویکی.
6. پشتی وەرگرتنا چارەسەرییێ.

ل دەڤ زارۆک و سنێلەیان (نێر - مێ):

1. ل دەمێ دەرکەڤتنا نیشانێن پێگەهشتنێ (بلوغ - Puberty) د ژییێ 9 سالییێدا ل دەڤ کچان و د 10 سالییێدا ل دەڤ کوڕان.
2. ل دەمێ گیرۆبوونا نیشانێن پێگەهشتنێ.
3. پشتی وەرگرتنا چارەسەرییێ.

**هندەك ژ نیشانێن پێگەهشتنێ (البلوغ - Puberty) ل دەڤ هەردوو ڕەگەزان:**

1. دەرکەڤتنا زڤرۆکا هەیڤانە ل دەڤ ڕەگەزێ مێ.
2. مەزنبوونا قەبارەیێ ئەندامێ زاوزێ ل دەڤ هەردوو ڕەگەزان.
3. گڕبوونا دەنگی.
4. مەزنبوونا ماسۆلکەیان.
5. تووڕەبوون.
6. دەرکەڤتنا موییان ل ئەندامێ زاوزێ.
7. مەزنبوونا مەمك و گونان.
8. دەرکەڤتنا موییان ل ڕوی و سمبێلان ب تایبەت ل دەڤ ڕەگەزێ نێر.



**هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ LH د ناڤ لەشیدا:**

ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:

1. وەرگرتنا چارەسەرییێن کیمیایی.
2. وەرگرتنا چارەسەرییێ ب ڕێکا تیشکێ.
3. هەوکرنێن دۆمدرێژ وەک تووشبوون ب ڤایرۆسێ Mumps
4. نەخۆشییێن بۆماوەیی وەکی Klinefelter's Syndrome
5. هەبوونا پەنجەشێرا گونان.
6. گەشەنەکرنا تەمام یا گونان.
7. هەبوونا نەخۆشییێن گرێدایی سیستەمێ بەرگرییا لەشی دژی خۆ.

ل دەڤ ڕەگەزێ مێ:

1. وەرگرتنا چارەسەرییێن کیمیایی.
2. وەرگرتنا چارەسەرییێ ب ڕێکا تیشکێ.
3. هەبوونا پەنجەشێرا هێلکەدانێ.
4. گەشەنەکرنا تەمام یا هێلکەدانێ.
5. هەبوونا کیسێ هێلکەدانێ (Polycystic Ovary Syndrome (PCOS
6. نەخۆشییێن بۆماوەیی وەکی Turner Syndrome
7. هەبوونا نەخۆشییێن گرێدایی ڕژێنا پەریزاد (الغدة الدرقية - Thyroid Gland).

**تێبینی:**

- کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ LH د ناڤ خوینێدا دبیت ئاماژە بیت ژ بۆ هەبوونا ئاریشەیان د ڕژێنا ژێرمێشکیدا یان د Hypothalamus دا، هەروەسان دبیتە ئەگەرێ کێمبوونا هۆرمۆنێ نێرینە Testestrone

هندەك ژ دەرمانێن ڕاستەوخۆ کارتێکرنێ ل ڕێژەیا هۆرمۆنێ LH دکەن د ناڤ لەشیدا:

- Anticonvulsants
- Clomiphene
- Digoxin
- Hormone Treatments
- Birth Control Pills

پشکنینا هۆرمۆنێ LH ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Luteinizing Hormone Test
- Luteinizing Hormone
- LH Test
- LH

## پشکنینا هۆرمۆنێ Follicle-Stimulating Hormone Test - FSH

مفا ژ پشـــکنینا FSH دهێته وەرگرتن ژ بۆ دەســـتنیشـــانکرنا ڕێژەیا هۆرمۆنێ Follicle-Stimulating Hormone د نـاڤ خوینێـدا، هۆرمۆنێ FSH دهێته هژمـارتن ژ گرۆپێ سـێکس هۆرمۆن و ژ لایێ ڕژێنا ژێرمێشـکیڤە دهێته دەردان، ب شـێوەیەکێ گشـتی ڕۆلێ سـەرەکی یێ هەی د ڕێکئێخسـتنا کارێ کۆئەندامێ زاوزێدا د هەردوو ڕەگەزاندا، د ڕەگەزێ مێدا هـاریکاریێا گەشـــەکرنا هێکان دکەت و هەروەســـا د قۆناغا Follicular Phase دا هۆرمۆنێ FSH پشـــتەڤانیا هێکان دکەت ژ بۆ دەردانا هۆرمۆنێ Estradiol ی (پشـــکنینا هۆرمۆنێ Estradiol د لاپەڕێن داهاتیدا هاتییە بەحسـکرن و شرۆڤەکرن ب شێوەیەکێ تێر و تەسـەل)، پاشان هەردوو هۆرمۆن پێکڤە دبنە ئەگەرێ گەشەکرنا تەمام یا هێکێ و ڕێژەیا هۆرمۆنێ FSH ل دەڤ ڕەگەزێ مێ دگەهیتە بلنـدترین ئـاســـت بەری هێـك بچیتە د هێلکەدانێـدا، ل دەڤ ڕەگەزێ نێر پشـــتەڤانیا گونان دکەت ژ بۆ دروســـتکرنا ســـپێرمێن پێگەهشـــتی، هەروەســـان د زارۆک و ســـنێلەیاندا ل دەســـتپێکێ ڕێژەیا هۆرمۆنێ FSH یێ کێمە پـاشـــان پیچ پیچە بەرەڤ بلندبوونێڤە دچیت، هەتا دگەهیتە قۆناغا پێگەهشـــتنێ و دەرکەڤتنا نیشانێن پێگەهشتنێ (بلوغ - Puberty).



### ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا هۆرمۆنێ FSH:

ل دەڤ ڕەگەزێ نێر(پێگەهشتی):

- 5 - 15 mU/ml

ل دەڤ ڕەگەزێ مێ:

| یەکە | ڕێژەیێن ئاسایی | بارودۆخ |
|---|---|---|
| mU/ml | 5 – 20 | Follicular/Luteal Phase |
| mU/ml | 30 – 50 | Midcycle Peak |
| mU/ml | زێدەتر ژ 35< | Postmenopausal |

### بۆچی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ FSH بهێتە ئەنجامدان:

ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:

1. ژ بۆ دەستنیشانکرنا ئەگەرێن گیرۆبوون و دووگیاننەبوونا خێزانا وی.
2. ژ بۆ دەستنیشانکرنا ئەگەرێن کێمبوونا هێزا سێکسی.

ل دەڤ ڕەگەزێ مێ:

1. ژ بۆ دەستنیشانکرنا ئەگەرێن گیرۆبوون و دووگیاننەبوونێ.
2. ژ بۆ دەستنیشانکرنا ئەگەرێن تێکچوونا زڤرۆکا هەیڤانە.
3. ژ بۆ دەستنیشانکرنا ئەگەرێن ڕاوەستیانا زڤرۆکا هەیڤانە ئەگەر ل دەمێ دووگیانبوونێ نەبیت.

### کەنگی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ FSH بهێتە ئەنجامدان؟

ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:

1. ل دەمێ هەبوونا نەزۆکییێ.
2. ل دەمێ کێمبوونا ڕێژەیا سپێرمان.
3. ل دەمێ کێمبوونا حەزا سێکسی.
4. ل دەمێ کێمبوونا هێزا سێکسی.
5. ل دەمێ کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ نێرینە Testestrone
6. ل دەمێ لاوازبوونا ماسۆلکەیان.

7. پشتی وەرگرتنا چارەسەرییێ.

ل دەڤ ڕەگەزێ مێ:

1. ل دەمێ هەبوونا نەزۆکییێ.
2. ل دەمێ تێکچوونا زڤڕۆکا هەیڤانە.
3. ل دەمێ چوون د ناڤ تەمەنێ بێئومێدیییێدا ب تایبەت ل دەمێ نێزیکبوونا ژنێ ژ ژییێ 45 سالییێ.
4. ل دەمێ ڕاوەستیانا زڤڕۆکا هەیڤانە.
5. هندەك جاران ژ بۆ دیارکرنا زڤڕۆکا هەیڤانە و دەستنیشانکرنا دەمێ دەردانا هێکێ ژ هێلکەدانێ ژ بۆ مالبچویکی.
6. پشتی وەرگرتنا چارەسەرییێ.

ل دەڤ زارۆک و سنێلەیان (نێر - مێ):

1. ل دەمێ دەرکەڤتنا نیشانێن پێگەهشتنێ (بلوغ - Puberty) د ژییێ 9 سالییێدا ل دەڤ کچان و د 10 سالییێدا ل دەڤ کوڕان.
2. ل دەمێ گیرۆبوونا نیشانێن پێگەهشتنێ.
3. پشتی وەرگرتنا چارەسەرییێ.

هندەك ژ نیشانێن پێگەهشتنێ (بلوغ - Puberty) ل دەڤ هەردوو ڕەگەزان:

1. دەرکەڤتنا زڤڕۆکا هەیڤانە ل دەڤ ڕەگەزێ مێ.
2. مەزنبوونا قەبارەیێ ئەندامێ زاوزێ ل دەڤ هەردوو ڕەگەزان.
3. گڕبوونا دەنگی.
4. مەزنبوونا ماسۆلکەیان.
5. تووڕەبوون.
6. دەرکەڤتنا موییان ل ئەندامێ زاوزێ.
7. مەزنبوونا مەمک و گونان.
8. دەرکەڤتنا موییان ل ڕوی و سمبێلان ب تایبەت ل دەڤ ڕەگەزێ نێر.



**هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ FSH د ناڤ لەشیدا:**

**ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:**

1. وەرگرتنا چارەسەرییێن کیمیایی.
2. وەرگرتنا چارەسەرییێ ب ڕێکا تیشکێ.
3. هەوکرنێن دۆمدرێژ وەک تووشبوون ب ڤایرۆسێ Mumps
4. نەخۆشییێن بۆماوەیی وەکی Klinefelter's Syndrome
5. هەبوونا پەنجەشێرا گونان.
6. گەشەنەکرنا تەمام یا گونان.
7. هەبوونا نەخۆشییێن گرێدایی سیستەمێ بەرگرییا لەشی دژی خۆ.

**ل دەڤ ڕەگەزێ مێ:**

1. هەبوونا کیسێ هێلکەدانێ (Polycystic Ovary Syndrome (PCOS
2. لاوازبوون یان نەمانا شیانێن هێلکەدانێ ژ بۆ دروستکرنا هێکان.
3. پەنجەشێرا هێلکەدانێ.
4. هەبوونا نەخۆشییێن گرێدایی ڕژێنا پەریزاد (الغدة الدرقية).
5. نەخۆشییێن بۆماوەیی وەک Turner Syndrome

**تێبینی:**

- کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ FSH د ناڤ خوینێدا ئاماژەیە ژ بۆ هێلکەدانێ کو هێکان دروست ناکەت ل دەڤ ژنان، هەروەسا ل دەڤ ڕەگەزێ نێر ئاماژەیە ژ بۆ هندێ سپێرم ب دروستی ژ لایێ گونانڤە ناهێنە دروستکرن و دبیت ئاماژە بیت ژ بۆ هەبوونا ئاریشەیان د ڕژێنا ژێر مێشکیدا یان د Hypothalamus دا.

**پشکنینا هۆرمۆنێ FSH ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:**

- Follicle-Stimulating Hormone Test
- FSH Test



## پشکنینا هۆرمۆنێ شیری Prolactin Test

پشکنینا Prolactin مفا ژێ دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا رێژەیا هۆرمۆنێ شیری د ناڤ خوینێدا، هۆرمۆنێ Prolactin ژ لایێ رژێنا ژێرمێشکیڤە دهێتە دەردان، هۆرمۆنێ شیری دبیتە ئەگەرێ هندێ سینگ گەشە بکەت و دەست ب دروستکرنا شیری بکەت ل دەمێ دووگیانبوون و پشتی دووگیانبوونێ و پاشان پیچە پیچە رێژەیا وێ دێ ئاسایی بیتەڤە، ب شێوەیەکێ ئاسایی رێژەیا هۆرمۆنێ Prolactin یێ کێمە ل دەڤ ژنێن نەدووگیان هەروەسان ل دەڤ رەگەزێ نێر ژی، ل دەمێ بلندبوونا رێژەیا هۆرمۆنێ شیری ل دەڤ رەگەزێ نێر هەردەم هۆرمۆنێ Testestrone یێ کێمە، پتریا جاران نۆژدار ل گەل پشکنینا هۆرمۆنێ شیری هندەك پشکنینێن دیتر ل گەل داخواز دکەت ژ بۆ دەستنیشانکرنا چەندین ئاریشەیێن تەندرۆستی ب تایبەت ئاریشەیێن گرێدایی ژنان ژ وان پشکنینێن هۆرمۆنێن LH , FSH , Testestrone , TSH (هەمی پشکنینێن ئاماژە پێهاتییە کرن هاتینە بەحسکرن و شرۆڤەکرن ب شێوەیەکێ تێر و تەسەل) ژ بەر کو راستەوخۆ یان نەراستەوخۆ ئەڤان هۆرمۆنان پەیوەندی یا ل گەل هۆرمۆنێ شیری هەی.

### رێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا هۆرمۆنێ شیری:

| رەگەز | رێژەیێن ئاسایی | یەکە |
|---|---|---|
| نێر | کێمتر بیت ژ 20> | ng/mL |
| مێ | کێمتر بیت ژ 25> | ng/mL |
| مێ/ دووگیان | 80 - 400 | ng/mL |



**کەنگی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ شیری Prolactin بهێتە ئەنجامدان؟**

1. ل دەمێ هەبوونا Prolactinoma جۆرەکە ژ گرێیێن ڕژێنا ژێرمێشکی.
2. ل دەمێ تێکچوونا زڤڕۆکا هەیڤانە.
3. ل دەمێ تووشبوون ب نەزۆکییێ ل دەڤ ژنان.
4. ل دەمێ هەبوونا ئاریشەیێن سێکسی ل دەڤ ڕەگەزێ نێر.
5. ل دەمێ لاوازبوونا هێزا سێکسی ل دەڤ هەردوو ڕەگەزان.

**نیشانێن بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ شیری Prolactin د ناڤ لەشیدا:**

**ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:**

1. مەزنبوونا سینگی.
2. کێمبوونا پرچێ.
3. لاوازبوونا هێزا سێکسی.
4. نەدروستبوونا سپێرمان.

**ل دەڤ ژنان:**

1. تێکچوونا زڤڕۆکا هەیڤانە.
2. ڕاوەستیانا زڤڕۆکا هەیڤانە بەری ژییێ 40 سالییێ ب Premature Menopause دهێتە بناڤکرن.
3. گیرۆبوونا دووگیانییێ.
4. نەزۆکی.
5. هاتنا شیری ژ سینگێ ژنێ بێی ب کریارا شیردانێ ڕابیت.
6. هشکبوونا ئەندامێ زاوزێ یێ مێیینە.
7. کێمبوونا حەزا سێکسی.



هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ شیری Prolactin د ناڤ لەشیدا:

1. ل دەمێ هەبوونا Prolactinoma جۆرەکە ژ گرێیێن ڕژێنا ژێرمێشکی.
2. هەبوونا ئاریشەیێن گرێدایی ڕژێنا پەریزاد.
3. نەخۆشییێن گرێدایی جگەر و گولچیسکان.
4. هەبوونا ئاریشەیان ل بەشێ Hypothalamus
5. هەبوونا کیسێ هێلکەدانێ Polycystic Ovary Syndrome
6. هەبوونا نەخۆشی و ئاریشەیان د ڕژێنا ژێر مێشکیدا Pituitary Gland
7. دووگیانبوون.
8. نەئارامبوون و بەردەوام هەبوونا سترێسێ.
9. شیردانا سرۆشتی.
10. بکارهینانا هندەك ژ جۆرێن دەرمانان.



پشکنینا هۆرمۆنێ شیری ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Prolactin Test
- Serum Prolactin Test



## پشکنینا هۆرمۆنێ دووگیانبوونێ β-hCG Test

مفا ژ پشـــکنینا هۆرمۆنێ دووگیانبوونێ دهێته وەرگرتن ژ بۆ دەســـتنیشـــانکرنا ڕێژەیا هـۆرمۆنێ Beta-Human Chorionic Gonadotropin د نـاڤ خوین و میزێـدا، ب شـــێوەیەکێ ئاســـایی هۆرمۆنێ β-hCG ل دەمێ دووگیانییێ ژ لایێ خانەیێن ویلاشـــێڤە دهێتە دەردان و دچیتە د ناڤ خوینێدا، ویلاش چییە؟ پشتی پیتاندنێ خۆراکی ددەتە هێکێ و ب دیوارێ مالبچویکیڤە دچەســـپینیت. هۆرمۆنێ β-hCG پشـــتی 11 ڕۆژان ژ پیتاندنا هێکێ د شـیاندایە د خوینێدا بهێتە دەستنیشـانکرن، هەروەسان پشتی 14 ڕۆژان ژ پیتاندنا هێکێ د شـیاندایە د میزێدا دەستنیشـان بکەین، پشتی پیتاندنا هێکێ ڕێژەیا هۆرمۆنێ β-hCG د هەر 48 هەتا 72 دەمژمێرانـدا ڕێژەیـا وێ دووهنـدە بلنـد دبیت، ڕێژەیا هۆرمۆنی بەردەوام د بلندبوونێدایە هەتا دگەهیتە 8 هەتا 11 هەفتییێن دەســـتپێکێ ژ دووگیانبوونێ، پاشی ڕێژەیا هۆرمۆنی بەرەڤ کێمبوونێڤە دچیت.



## رێژەیێن ئاسایی یێن پشكنینا هۆرمۆنێ β-hCG:

- ل دەڤ رەگەزێ نێر كێمتر بیت ژ: 2.00 mIU/mL>
- ل دەڤ رەگەزێ مێ ئەگەر نە ب دووگیان بیت كێمتربیت ژ: 5.0 mIU/ml>
- ل دەڤ رەگەزێ مێ ئەگەر یا ب دووگیان بیت:

| یەكە | رێژەیێن ئاسایی | Weeks - أسابیع - هەفتی |
| --- | --- | --- |
| mIU/ml | 5 - 50 | هەفتییا سێیێ |
| mIU/ml | 5 - 426 | هەفتییا چارێ |
| mIU/ml | 18 - 7,340 | هەفتییا پێنجێ |
| mIU/ml | 1,080 - 56,500 | هەفتییا شەشێ |
| mIU/ml | 7,650 - 229,000 | هەفتییا ٧ هەتا ٨ |
| mIU/ml | 25,700 - 288,000 | هەفتییا ٩ هەتا ١٢ |
| mIU/ml | 13,300 - 254,000 | هەفتییا ١٣ هەتا ١٦ |
| mIU/ml | 4,060 - 165,400 | هەفتییا ١٧ هەتا ٢٤ |
| mIU/ml | 3,640 - 117,000 | هەفتییا ٢٥ هەتا ٤٠ |



## بۆچی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ β-hCG بهێتە ئەنجامدان؟

1. ژ بۆ دەستنیشانکرنا دووگیانبوونێ.
2. ژ بۆ دەستنیشانکرنا دووگیانبوونا نەتەندرۆست وەکی دووگیانبوون ژ دەرڤەی مالبچویکی Ectopic Pregnancy
3. ژ بۆ دەستنیشانکرنا تەمەنێ زارۆکی ب نێزیکی.
4. ژ بۆ چاڤدێریکرن و هەبوونا نەدروستییێ د جینێن زارۆکیدا وەکی Down Syndrome
5. ژ بۆ دەستنیشانکرنا هندەك ژ جۆرێن پەنجەشێرێ وەکی د ژناندا پەنجەشێرا مەمك و مالبچویک و هێلکەدانێ، هەروەسان د زەلاماندا پەنجەشێرا گونان هەروەسان هندەك جۆرێن دی یێن پەنجەشێرێ وەکی پەنجەشێرا جگەر و پیست و سیهان د هەردوو ڕەگەزاندا.

## کەنگی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ β-hCG بهێتە ئەنجامدان؟

1. ل دەمێ هەستکرن ب دووگیانییێ پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ β-hCG بهێتە ئەنجامدان و باشترین دەم بۆ ئەنجامدانا پشکنینێ پشتی دەربازبوونا 11 ڕۆژا ب ڕێکا خوینێ و 14 ڕۆژان ب ڕێکا میزێ ژ گیرۆبوونا زڤرۆکا هەیڤانە.
2. ل دەمێ دەرکەڤتنا نیشانێن دووگیانییێ ل دەرڤەی مالبچویکی، نیشانێن هەبوونا دووگیانبوونێ ل دەرڤەی مالبچویکی وەکی: (هەبوونا خوینێ، هەبوونا ئازاران ل بەشێ خوارێ یێ پشت و زکی و ...هتد). هەروەسا هندەك جاران نیشانێن وەك کێمبوونا پەستانا خوینێ و گێژبوون و هەستکرن ب ماندیبوون و لاوازبوونێ و ...هتد.
3. ل دەمێ هەستکرن ب هەبوونا خانەیێن پەنجەشێرێ ب تایبەت د ئەندامێ زاوزێدا.
4. ل دەمێ هەستکرن ب نیشانێن نەخۆشییا Gestational Trophoblastic Disease ژ نیشانێن ئەڤێ نەخۆشییێ هەبوونا خوینێ ل دەمێ دووگیانییێ، کێم خوینی و بێهێزی، زێدەبوونا بلەز یا ڕێژەیا هۆرمۆنی و گیرۆبوون و دەرنەکەڤتنا زارۆکی د پشکنینا سۆنەرێدا.



## هندەك ژ نیشانێن دەستپێکێ یێن دووگیانبوونێ:

1. نەمانا زڤڕۆکا هەیڤانە.
2. هەلاڤێتن.
3. سەرئێشان.
4. لەرزین.
5. گوهۆڕینا سرۆشتێ کەسی(تغيرات في المزاج).
6. هەستکرن ب بێهنتەنگبوونێ.
7. زکئێشان.
8. هەبوونا غازاتان.
9. ئێشانا بەشێ خوارێ یێ پشتێ.
10. زۆربوونا جارێن میزکرنێ.
11. زێدەبوونا هەستیارییێ ب بێهنان.
12. بلندبوونا پلەیا گەرمییا لەشی.



**ڕامانا ئەنجامێن پشکنینا هۆرمۆنێ دووگیانبوونێ β-hCG:**

- کێمبیا ڕێژەیا هۆرمۆنێ β-hCG د ناڤ خوین یان میزێدا ئاماژەیە ژ بۆ هندێ پیتاندنا هێکێ ڕوینەدایە یان پێشــوەخت پشــکنین یا هاتییە ئەنجامـدان، ژ بەر کو پێدڤی ب دەربازبوونا 11 یان 14 ڕۆژان هەیە ب سەر پیتاندنا هێکێدا هەتا ڕێژەیا هۆرمۆنی د خوین یان میزێدا بهێتە دەستنیشانکرن.

- بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنی ب شێوەیەکێ ئاسایی ڕامانا پیتاندنا هێکێ(دووگیانبوون)ـــێ ڕادگەهینیت.

- بلندبوونەکا هێدی(بلندبوونەکا کێمتر ژ یا ئاســایی) یا ڕێژەیا هۆرمۆنێ β-hCG د ژناندا ڕامانا دووگیانبوونێیە ژ دەرڤەی مالبچویکی، ژ بەر کو د بارودۆخێن ئاسایی پشتی پیتاندنا هێکێ ڕێژەیا هۆرمۆنێ د هەر 48 هەتا 72 دەمژمێراندا ڕێژەیا وێ دووهندە زێدە دبیت.

- کێمبوونا ژ نشـــکەکێڤە یا ڕێژەیا هۆرمۆنێ β-hCG د ژنا دووگیاندا دبیت ژ ئەگەرێ ژبەرچوونا زارۆکی بیت یان ژ بەر هژمارکرنا نەدروســـت یا ڕۆژێن دووگیانبوونێ بیت، بەلێ ئەگەر پشـــتی ژبەرچوونا زارۆکی ڕێژەیا هۆرمۆنی ب تەمامی کێم نەبوو ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا شانەیا بەرهەمهینانا هۆرمۆنی هێشتا یا د مالبچویکیدا مایی و پێدڤییە بهێتە لابرن ل دویڤ ڕاوێژ و چاڤدێرییا نۆژدارا تایبەتمەندڤە.

- د زەلام و ژناندا(ئەگەر دووگیانبوون نەبیت ل دەڤ ژنان) ب شـێوەیەکێ ئاســایی ڕێژەیا هۆرمۆنی پێدڤییە گەلەک یا کێم بیت، ژ بەر هندێ هەر بلندبوونەك د ڕێژەیا ئاســـایی یا هۆرمۆنیدا پەیدا ببیت دبیت ئاماژە بیت ژ بۆ هەبوونا سەرهەلدانا خانەیێن پەنجەشێرێ.

- بلنـدبوونا بلەزتر ژ یا ئاســـایی یا ڕێژەیا هۆرمۆنێ β-hCG د ژنا دووگیاندا دبیت (ژ بەر هژمارکرنا نەدروســـت یا ڕۆژێن دووگیانبوونێ بیت) یان ژ بەر هەبوونا (زارۆکێن دوانە یان سێیانە...) بیت.

**پشکنینا هۆرمۆنێ دووگیانبوونێ ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:**

- **Beta-Human Chorionic Gonadotropin Test**
- **β-hCG Test**
- **β-hCG Titer Test**

## پشکنینا هۆرمۆنێ ئێپنفرین Epinephrine Test

هۆرمۆنێ Epinephrine ژ لایێ رژێنا ئەدرینال گلاندڤە دهێتە دەردان، ئەدرینال گلاند چییە؟ دوو رژێنێن بچویکن دکەڤنە بەشێ سەری یێ گولچیسکان. بەری بهێتە گوهۆرین بۆ Epinephrine دبێژنێ Catecholasmines (پشکنینا Catecholasmines د لاپەرێن داهاتیدا ب تێر و تەسەل هاتییە شرۆڤەکرن)، کاتیکۆلمینز ل دەستپێکێ Norepinephrine و هەروەسان Dopamine دروست دکەت پاشان Epinephrine دروست دبیت، ئەڤ هۆرمۆنە دڕێژیتە د ناڤ خوینێدا د بارودۆخێن ئاساییدا بەرپرسە ژ پارچەکردارێن فیزیایی و سترێسێ.

رێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا هۆرمۆنێ Epinephrine:

- Epinephrine : 0 - 140 pg/mL (764.3 pmol/L)
- norepinephrine : 70 - 1700 pg/mL (413.8 - 10048.7 pmol/L)



## کەنگی و بۆچی پێدڤییە پشکنینا Epinephrine بهێتە ئەنجامدان؟

ل دەمێ هۆرمۆنێ Epinephrine ب رێژەیەکا زۆر دڕێژیتە د ناڤ زڤرۆکا خوینێدا ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا گرێیێن پەنجەشێرێ ل سەر گولچیسکان، ب رێکا (میزێ یان خوینێ) پشکنین بۆ نەخۆشی دهێتە کرن ژ بۆ پشتڕاستبوون ژ تەندرۆستبوونا گولچیسکان.

**نیشانێن بلندبوونا ڕێژەیا Epinephrine یان Norepinephrine د ناڤ لەشیدا:**

1. خوهدان.
2. بلندبوونا پەستانا خوینێ.
3. گوهۆڕینا ڕەنگێ پیستی.
4. هەبوونا ئاریشەیان د لێدانێن دلیدا.
5. تووڕەبوون.

**نیشانێن کێمبوونا ڕێژەیا Epinephrine یان Norepinephrine د ناڤ لەشیدا:**

1. سترێس.
2. بەردەوام هەستکرن ب فشارێ.
3. بەردەوام هەستکرن ب نەرێنیبوونێ.
4. کێمبوونا پەستانا خوینێ Hypotension
5. کێمبوونا ڕێژەیا شەکرێ Hypoglycemia
6. سەرئێشان.
7. هەبوونا ئاریشەیان د نڤستنێدا.

**پشکنینا هۆرمۆنێ Epinephrine ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:**

- Epinephrine Test
- Epin Test
- Epinephrine

## پشکنینێن کاتێکۆلامین Catecholamine Tests

مفا ژ پشکنینا Catecholamine دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڕێژەیا هۆرمۆنێ کاتێکۆلامین دناڤ خوین و میزێدا ، هەردووک رژێنێن ئەدرینال(رژێنێن ئەدرینال دوو رژێنێن بچویکن دکەڤنە د سەر هەردوو گولچیسکاندا) کاتێکۆلامینی بەرهەمدهینن و دهێتە نیاسین وەکی هۆرمۆن، هۆرمۆنێ Catecholamine دهێتە دەردان ژ بۆ ناڤ لەشی وەکو بەرسڤدانەک د بارودۆخێن پارچەکردارێن فیزیایی و سترێسێدا ، جورێن سەرەکیێن Catecholamines دهێنە نیاسین ب Dopamine و Norepinephrine و هەروەسا Epinephrine(هەروەسا دهێتە نیاسین ب Adrenaline)، ل دەمێ بلندبوونا ڕێژەیا ئەنجامێ Dopamine, Norepinephrine, Epinephrine ب ئاماژەیەکا ب هێز دهێتەدانان ژ بۆ هەبوونا ئاریشەیەکا مەترسیدارا تەندرۆستی.



**ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینێن Catecholamines:**

| پشکنین | ڕێژەیێن ئاسایی | یەکە |
|---|---|---|
| Epinephrine | 0 - 140 | Pg/mL |
| Norepinephrine | 70 - 1700 | Pg/mL |
| Dopamine | 0 - 30 | Pg/mL |

**پێدڤییە ل دەمێ ئەنجامدانا پشکنینا Catecholamines بۆ ماوێ ٢ هەتا ٣ ێ ڕۆژان دویربکەڤی ژ....**

- ☒ ئەوان خوارن و ڤەخوارنێن کافایین دناڤدا هەی وەکی(چا، قەهوە و چوکولاتا) و ....هتد.
- ☒ خوارنا موزا.
- ☒ پێکهاتەیێن ترشاتی دناڤدا.
- ☒ ئەوان خوارنێن ڤانێلا د پێکهاتا واندا هەی.
- ☒ هندەک ژ جورێن دەرمانان.

**تێبینی:**

- گەلەک یا گرنگە ل بەری ئەنجامدانا پشکنینێ دویربکەڤی ژ سترێس و ترسێ.

## بۆچی پێدڤییە پشکنینێن هۆرمۆنێ Catecholamines بهێنە ئەنجامدان؟

پتریا جاران پشکنینێن کاتیکولامینز دهێنە ئەنجامدان ژ بۆ دەستنیشانکرن و چاڤدێریکرنا هندەک ژ جورێن پەنجەشێرێ یێن دەگمەن وەکی Paraganglioma، بارودۆخێ Paraganglioma چییە؟ جورەکە ژ جۆرێن گرێیان ل نێزیکی ڕژێنێن ئەدرینال، پتریا جاران ئەڤ گرێیە گرێیێن پەنجەشێرینە، بەلێ پتریا جاران گەلەک ب شێوەیەکێ هێدی گەشەدکەن.

1. Pheochromocytoma: گرێیەکە د ڕژێنا ئەدرینالدا، پتریا جاران ئەڤ جورێ گرێیان د خرابن بەلێ نەیێن پەنجەشێرینە، بەلێ د شیاندا هەیە ببیتە ئەگەرێ مرنێ ئەگەر زوی نە هێتە چارەسەرکرن ل ژێر ڕاوێژ و چاڤدێریا نۆژدارێن تیابەتمەندڤە.
2. Neuroblastoma: گرێیەکا پەنجەشێرییە گەشەدکەت د شانەیێن دەماریدا، پتریا دەمان زارۆک و زارۆکێن تازەژدایکبووی تووشدبن.
3. هەروەسا ئەڤ پشکنینە دهێنە ئەنجامدان ل دەمێ وەرگرتنا چارەسەرییان ژ بۆ زانینا کاریگەرییا دەرمانێن ب نەخۆشی هاتینەدان ل ژێر چاڤدێری و ڕاوێژا نۆژدارێن تیابەتمەندڤە.

**تێبینی:**

- مەرج نینە هەر بلندبوونەک د ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا Catecholamines پەیدا ببیت ئاماژە بیت ژ بۆ هەبوونا نەخۆشییێن ل سەری هاتینە بەحسکرن ژ بەر کو زۆر ئەگەر هەنە د شێن کارتێکرنێ ل ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ بکەن ژوان (سترێس، کرنا ڕاهێنانێن بهێز، کافایین، جگارەکێشان، ب کارهینانا کحولی) و....هتد.

## کەنگی پێدڤییە پشکنینێن هۆرمۆنێ Catecholamines بهێنە ئەنجامدان؟

پێگەهشتی و زارۆک ل دەمێ هەبوونا گومان و نیشانێن گرێیان پێدڤییە پشکنینا Catecholamines ئەنجامبدەن.

## ژ هەبوونا نیشانێن گرێیان ل دەڤ زارۆکان:

1. هەبوونا ئێشانێ د هەستییاندا.
2. پێتیبوونا هەستییان.
3. هەبوونا گرێیێن نەئاسایی ل ناوچەیا زکی.
4. نە کونترۆلکرنا لڤینێن چاڤی.
5. کێمبوونا کێشا لەشی بێی هەبوونا ئەگەرەک دەستنیشانکری.

## ژ هەبوونا نیشانێن گرێیان ل دەڤ پێگەهشتییان:

1. سەرئێشانەکا ب هێز.
2. بلندبوونا پەستانا خوینێ.
3. خۆهدان.
4. نەئاساییبوونا لێدانێن دلی.



## پشکنینێن Catecholamines ب ڤان شێوازان دهێنە نڤیسین:

- Catecholamine Tests
- Dopamine
- Norepinephrine
- Epinephrine
- Free catecholamines

## پشکنینا هۆرمۆنێ پاراسایرۆید Parathyroid Hormone (PTH) Test

مفا ژ پشکنینا PTH دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڕێژەیا هۆرمۆنێ پاراسایرۆید د ناڤ خوینێدا، هۆرمۆنێ پاراسایرۆید ژ لایێ پاراسایرۆید ڕژێنێڤە دهێتە دەردان، ڕژێنا پاراسایرۆید چییە؟ ڕژێنا پاراسایرۆید دکەڤیتە پشت ڕژێنا سایرۆید، بەرپرسە ژ وەکهەڤکرن و کونترۆلکرنا کالسیوومی د ناڤ لەشیدا، توخمێ کالسیوومی ب گرنگ دهێتە هژمارتن ژ بۆ لەشی ب تایبەت هەستییان و ددانان دپارێزیت و بهێز دهێلیت، هەروەسان کالسیووم ب ڕێژەیا 1Kg ژ ڕێژەیا کێشا لەشی پێکدهینیت و ب ڕێژەیا 99% ژ بۆ هەستییان دچیت و ب تنێ ب ڕێژەیا 1% دچیتە د ناڤ زڤرۆکا خوینێدا ، هەر نەئاساییبونەك د ڕێژەیا ئاسایی یا هۆرمۆنێ پاراسایرۆیددا پەیدا ببیت ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا ئاریشەیێن تەندرۆستی یێن جودا.

**ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا هۆرمۆنێ Parathyroid:**

- 10-55 pg/mL




**کەنگی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ Parathyroid بهێتە ئەنجامدان؟**

ل دەمێ هەبوونا نیشانێن بلندبوون یان کێمبوونا ڕێژەیا کالسیوومی د ناڤ لەشیدا پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ پاراسایرۆید بهێتە ئەنجامدان.

نیشانێن بلندبوونا ڕێژەیا کالسیوومی Hypercalcemia د ناڤ لەشیدا:



1. سەرئێشان.
2. تێهنیبوون.
3. زۆر میزکرن.
4. زکئێشان.
5. هەلاڤێتن.
6. کێمبوونا حەزا خوارنێ.
7. نەئاساییبوونا لێدانێن دلی.
8. ئێشانا هەستییان.
9. ماندیبوون.
10. هەستکرن ب لاوازبوونێ.

نیشانێن کێمبوونا ڕێژەیا کالسیوومی Hypocalcemia د ناڤ لەشیدا:

1. زوی ژبیرکرن و ژدەستدانا هزروبیران.
2. هەستکرن ب فشارێ.
3. بلندبوونا پەستانا خوینێ.
4. هەبوونا نەڕێکوپێکییێ د لێدانێن دلیدا.



5. بێهێزبوونا نینۆکان.
6. شکەستنا هەستییان بێی بەرکەڤتن ب زەبرەک بهێز.
7. لاوازبوونا هەستییان .
8. ئێشانا گەه و هەستییان.
9. گیرۆبوونا گەشەیا زارۆکان.
10. کێمبوونا ڕێژەیا مەگنسیووم و فۆسفۆری د ناڤ لەشیدا.
11. هەبوونا گرژبوونێ د ماسۆلکەیاندا.
12. هەبوونا ئاریشەیان د مەیینا خوینێدا.
13. هەبوونا ئاریشەیان ل دەمێ نڤستنێ.

**بۆچی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ Parathyroid بهێتە ئەنجامدان:**

1. ژ بۆ دەستنیشانکرنا Hyperparathyroidism ل دەمێ ڕژێنا پاراسایرۆید زێدەتر ژ پێدڤییا لەشی هۆرمۆنێ پاراسایرۆید بەرهەم دهینیت.
2. ژ بۆ دەستنیشانکرنا Hypoparathyroidism ل دەمێ ڕژێنا پاراسایرۆید کێمتر ژ پێدڤییا لەشی هۆرمۆنێ پاراسایرۆید بەرهەم دهینیت.
3. ل دەمێ نەئاسایيبوونا ڕێژەیا کالسیوومی د ناڤ لەشیدا ژ بۆ ئاگەهداربوون ژ تەندرۆستی و زانینا ڕەوشا ڕژێنا پاراسایرۆید.
4. ژ بۆ چاڤدێریکرنا نەخۆشییێن گرێدایی گولچیسکان.

**هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ Parathyroid د ناڤ لەشیدا:**

1. ل دەمێ ڕژێنا پاراسایرۆید زێدەتر ژ پێدڤییا لەشی هۆرمۆنێ پاراسایرۆید بەرهەم دهینیت Hyperparathyroidism
2. هەبوونا گرێیان د ڕژێنا پاراسایرۆیددا Parathyroid Gland ژبلی گرێیێن پەنجەشێرێ.
3. کێمبوونا ڤیتامین D - Vitamin D Deficiency
4. وەرنەگرتنا ڕێژەیا پێدڤیا کالسیوومی ژ خوارنێ ل دویڤ پێدڤییا لەشی.

**هۆکارێن دبنە ئەگەرێ کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ Parathyroid د ناڤ لەشیدا:**

1. ل دەمێ ڕژێنا پاراسایرۆید کێمتر ژ پێدڤییا لەشی هۆرمۆنێ پاراسایرۆید بەرهەم دهینیت Hypoparathyroidism
2. وەرگرتنا ڕێژەیەکا زۆر ژ کالسیوومی.
3. وەرگرتنا ڕێژەیەکا زۆر ژ ڤیتامین D

**پشکنینا هۆرمۆنێ Parathyroid ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:**

- Parathyroid Hormone Test
- PTH Test
- PTH
- Parathhormone Test

## پشکنینا هۆرمۆنێ ئیریسرۆپۆیتن Erythropoietin (EPO) Test

مفا ژ پشـــکنینا EPO دهێته وەرگرتن ژ بو دەســـتنیشـــانکرنا رێژەیـا هۆرمۆنێ Erythropoietin د نـاڤ خوینێـدا، پتریا هۆرمۆنێ Erythropoietin دهێته دەردان ژ لایێ گولچیسکانڤە، هەروەسان ب رێژەیەکا کێم ژ لایێ جگەرێڤە دهێتە دەردان، کارێ سەرەکی یێ هۆرمۆنێ EPO پشـتەڤانییا مەژییێ هەسـتی دکەت ژ بۆ بەرهەمهینانا خرۆکێن سـۆرێن خوینێ و هیمۆگلۆبینی و دروسـتکرنا هەڤسـەنگییێ د رێژەیا بەرهەمهینانا خرۆکێن سـۆردا، هەر ژ بەر هندێ ل دەمێ کێم گەهشـتنا رێژەیا ئۆکسجینێ ژ بۆ خانەیان گولچیسك دەست ب دەردانا هۆرمۆنی دکەن ژ بۆ پشـتەڤانیکرنا مەژییێ سۆرێ هەستی ژ بۆ پتر بەرهەمهینانا خرۆکێن سۆر و هەتا ئاساییبوونا رێژەیا ئۆکسجینێ د ناڤ خوینێدا دێ هێتە دەردان، هەر ژ بەر هندێ بۆ ماوەیەکێ کێم چالاك دمینیت پاشان ب رێکا میزێ دچیتە ژ دەرڤەی لەشی.

**رێژەیا ئاسایی یا پشکنینا هۆرمۆنێ EPO:**

- **18.4 - 2.6 mU/Ml**



## بۆچی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ Erythropoietin بهێتە ئەنجامدان؟

1. ژ بۆ دەستنیشانکرنا هۆکارێن کێم خوینییێ Anemia
2. هاریکارە ژ بۆ دەستنیشانکرنا هەبوونا ئاریشەیێن گرێدایی مەژییێ سۆرێ هەستی.
3. ژ بۆ دەستنیشانکرنا هۆکارێن بلندبوون یان کێمبوونا رێژەیا خرۆکێن سۆرێن خوینێ ژ لایێ مەژییێ سۆرێ هەستیڤە.
4. ژ بۆ دەستنیشانکرنا هندەك ژ ئاریشەیێن گرێدایی گولچیسکان.

## پشکنینا هۆرمۆنێ EPO ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Erythropoietin Test
- EPO Test
- EPO



## پشکنینا پرۆجسترۆن Progesterone Test

پشکنینا Progesterone دهێته ئەنجامدان ژ بۆ دەستنیشانکرنا رێژەیا هۆرمۆنێ پرۆجسترۆن دناڤ خوینێدا، پرۆجسترۆن هۆرمۆنەکه دهێته دەردان ژ لایێ هێلکەدانێڤە ل دەڤ ئافرەتان، پرۆجسترۆن رولەکێ گرنگ یێ هەی د دووگیانبوونێدا، دبیته هاریکار ژ بۆ مالبچویکی و ئامادەکرنێ ژ بۆ پشتەڤانیکرن ل هێکا پیتاندی، هەروەسا هۆرمۆنێ پروجسترون هاریکاریا سینگی دکەت ژ بۆ دروستکرنا شیری، ل دەمێ ئافرەت یا ب دووگیان بیت رێژەیا هۆرمۆنێ Progesterone دەه جاران پترە ب بەراوردکرن ل گەل ئافرەتێ دەمێ یا ب دووگیان نەبیت، هەروەسا ل دەڤ زەلامان ژی پروجسترون دهێتە دروستکرن بەلێ ب رێژەیەکا کێمتر، ل دەڤ زەلامان هۆرمۆنێ Progesterone دهێتە دروستکرن ژلایێ هەردووک رژێنێن ئەدرینال(رژێنێن ئەدرینال: دوو رژێنێن بچویکن دکەڤنە د سەر گولچیسکاندا) و گونانڤە.



## ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا هۆرمۆنێ Progesterone:

ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ل گۆڕەی تەمەن و ڕەگەز و دووگیانبوون و زڤرۆکا هەیڤانە دهێتە گوهورین، ل دەستپێکا زڤرۆکا هەیڤانە ل دەڤ ئافرەتان ڕێژەیا هۆرمۆنی یا کێمە پاشان بەرەڤ بلندبوونێڤە دچیت هەتا دگەهیتە بلندترین ئاست و ئەگەر پیتێن هاتە ڕوویدان ڕێژەیا هۆرمۆنی دێ ب بلندی مینیت هەتا ژدایکبوونا زارۆکی، بەلێ ئەگەر پیتاندن نەهاتە ڕویدان ڕێژەیا هۆرمۆنی دووبارە دێ کێم بیتەڤە **(هەیڤانە ئەڤ پرۆسێسە دهێتە ڕویدان)**. ڕێژەیا هۆرمۆنی ل دەڤ زەلامان کێمترە ب بەراوردکرن دگەل ئافرەتان **و هەروەسا** ڕێژەیا هۆرمۆنی ل دەڤ ئافرەتا دووگیان دەهـ جاران پترە ب بەراوردکرن ل گەل ئافرەتێ دەمێ یا ب دووگیان نەبیت.

| یەکە | ڕێژەیا ئاسایی | ڕەگەز |
|---|---|---|
| ng/ml | 1.4 - 0.2 | نێر/ زەلامان |

ل دەڤ ئافرەتان:

| یەکە | ڕێژەیێن ئاسایی | بارودۆخ |
|---|---|---|
| ng/ml | 0.2 - 1.5 | Follicular Phase |
| ng/ml | 0.8 - 3.0 | Ovulation Phase |
| ng/ml | 1.7 - 26.5 | Luteal Phase |
| ng/ml | 0.1 - 0.8 | Post Menopaus |



**بۆچی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ Progesterone بهێتە ئەنجامدان:**

1. ژ بۆ دەستنیشانکرنا ئەگەرێن نەزوکییێ.
2. ژ بۆ چاڤدێریکرنا مەترسییێن دووگیانبوونێ.
3. ژ بۆ دەستنیشانکرنا دەرچوونا هێکێ ژ هێلکەدانێ بۆ مالبچویکی.
4. ژ بۆ چاڤدێریکرنا دووگیانبوونا نەدروست وەکی دووگیانبوون ژ دەرڤەی مالبچویکی Ectopic Pregnancy پتریا جاران دبیتە ئەگەرێ مەترسییێ ل سەر ژیانا ئافرەتێ.

**کەنگی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ Progesterone بهێتە ئەنجامدان:**

1. ل دەمێ دووگیاننەبوونێ ژ بۆ پشتراستبوون ژ تەندرۆستییا هێلکەدانێ و دەرچوونا هێکێ ژ بۆ مالبچویکی.
2. ل دەمێ هەبوون و دیتنا خوینا نەئاسایی.
3. ل دەمێ هەبوونا نیشانێن دووگیانبوونێ ژ دەرڤەی مالبچویکی.
4. ل دەمێ دووگیانبوونێ ژ بۆ پشتراستبوون ژ تەندرۆستییا دووگیانییێ.
5. ل دەمێ وەرگرتنا چارەسەرییا هۆرمۆنی ژ لایێ نەخۆشیڤە ل ژێر ڕاوێژ و چاڤدێرییا نۆژدارا تایبەتمەندڤە ژ بۆ زانینا کاریگەرییا دەرمانان ل سەر نەخۆشی.



## نیشانێن بلندبوونا رێژەیا هۆرمۆنێ Progesterone دناڤ لەشیدا:

1. هەبوونا هەوکرنان د ئەندامێ زاوزێدا.
2. زێدەبوونا کێشا لەشی.
3. وەرمتن.
4. گوهورین د حەزا خوارنێدا.
5. هەبوونا گرژبوونان.
6. گوهورینا سروشتێ کەسی (التغیرات مزاج).
7. هەستکرن ب ماندیبوون و لاوازبوونێ.



## نیشانێن کێمبوونا رێژەیا هۆرمۆنێ Progesterone دناڤ لەشیدا:

1. سەرئێشان.
2. لەش ئێشان.
3. وەرمتن.
4. هەستکرن ب پەستانێ.
5. هەستکرن ب ماندیبوون و لاوازبوونێ.
6. هەبوونا ئاریشەیان د نڤستنێدا.
7. هەبوونا ئاریشەیان د مەمکاندا.
8. سترێس.



**ڕامانا ئەنجامێن پشکنینا هۆرمۆنێ Progesterone:**

**- ئەگەر ئەنجامێ پشکنینێ بلندتر بوو ژ ڕێژەیا ئاسایی ئاماژەیە ژ بۆ....**

1. دووگیانبوونێ.
2. دووگیانبوونا جورێ Molar Pregnancy
3. هەبوونا کیسێن هێلکەدانێ.
4. هەبوونا ئاریشەیان د ڕژێنا ئەدرینالدا.
5. تووشبوون ب پەنجەشێرا هێلکەدانێ.

**تێبینی:**

- ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ دێ بلندتر بیت ژ ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئەگەر ئافرەت یا ب دووگیانبیت ب دوانە و سێیانە و....هتد.

**- ئەگەر ئەنجامێ پشکنینێ کێمتر بوو ژ ڕێژەیا ئاسایی ئاماژەیە ژ بۆ....**

1. دووگیانبوون ژ دەرڤەی مالبچویکی Ectopic Pregnancy
2. لاوازبوونا هێلکەدانێ و هەبوونا ئاریشەیان ل دەمێ دەرچوونا هێکێ ژ هێلکەدانێ ژ بۆ مالبچویکی.
3. تێکچوونا زڤرۆکا هەیڤانە.
4. ژبەرچوونا زارۆکی.

**پشکنینا هۆرمۆنێ پرۆجسترۆن ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:**

- Progesterone Test
- Serum Progesterone
- Progesterone Blood Test
- PGSN

## پشکنینێن گرۆپێ هۆرمۆنێن ئیسترۆجین Estrogen Levels Test

دشیاندایە ب رێکا پشکنینێن Estrogens رێژەیا هۆرمۆنێن گرۆپێ Estrogen د خوین و میز و هەروەسا تفێدا دەستنیشان بکەین، Estrogens گرۆپەکێ هۆرمۆنانە رۆلەکێ گرنگ هەیە د گەشەیا جەستەیی و فسیولوجی ل دەڤ رەگەزێ مێ وەکی گەشەکرنا مەمکان و مالبچویکی و راگرتنا بالانس و رێکخستنا زڤرۆکا هەیڤانە و...هتد، هەروەسا ل دەڤ رەگەزێ نێر ژی هۆرمۆن دهێتە دروستکرن بەلێ ب رێژەیەکا کێمتر ب چاڤ رێژەیا دروستکرنێ ل دەڤ رەگەزێ مێ. ب رێکا ئەنجامێ پیڤانا رێژەیا پشکنینا هۆرمۆنێن Estrogens دشێین پیزانینێن گرنگ ب دەست مە ب کەڤن ژ بۆ زانینا شیانێن دووگیان بوونێ ل دەڤ ئافرەتێ و هەروەسا تەندرۆستییا دووگیانییێ و زڤرۆکا هەیڤانە و...هتد.

ژ گرنگترین پشکنینێن گرۆپێ هۆرمۆنێن ئیسترۆجین:

1. پشکنینا Estrone
2. پشکنینا Estradiol (E2)
3. پشکنینا Estriol

**تێبینی:**

- هەمی پشکنینێن ل سەری ئاماژەپێکری د لاپەرێن داهاتیدا هاتینە بەحسکرن و شرۆڤەکرن ب شێوەیەکێ تێر و تەسەل.



گەلەک جورێن هۆرمۆنێ Estrogens هەنە بەلێ ب تنێ ٣ جور ژ وان ب شێوەیەکێ زۆر دهێنە پشکنینکرن ژوان:

1. پشکنینا Estrone: دهێتە نیاسین ب E1، ب هۆرمۆنێ سەرەکییێ مێینە دهێتە هژمارتن ژ لایێ ئافرەتێڤە دهێتە دروستکرن پشتی چوون د قوناخا Menopause دا ، ل دەمێ ئافرەت دچیتە دناڤ قوناخا Menopause دا ل وی دەمی زڤرۆکێن هەیڤانەیێن ئافرەتێ ب دووماهی دهێن و د ڕاوەستیێن ژبەر هندێ ئێدی ئەو ئافرەت نەشێت ب دووگیان ب کەڤیت، پتریا جاران ئەڤ قوناخە دەستپێدکەت ل دەمێ ئافرەت دچیتە د ژییێ ٤٥ هەتا ٥٠ سالییێدا و دهێتە نیاسین ب چوون بەرەڤ تەمەنێ بێئومێدییێ.

2. پشکنینا Estradiol: دهێتە نیاسین ب E2، ، ب هۆرمۆنێ سەرەکییێ مێینە دهێتە هژمارتن ژ لایێ ئەوان ئافرەتانڤە دهێتە دروستکرن یێن نە ب دووگیان(ب شێوەیەکێ تێر و تەسەل پشکنینا Estradiol یا هاتییە بەحسکرن و شرۆڤەکرن د لاپەڕێن داهاتیدا).

3. پشکنینا Estirol: دهێتە نیاسین ب E3، ئەڤ هۆرمۆنە ڕێژەیا وێ بلند دبیت د ماوەیێ دووگیان بوونا ئافرەتێدا.



بۆچی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێن گرۆپێ Estrogens بهێنە ئەنجامدان؟

پشکنینا هۆرمۆنێ Estrone دهێتە ئەنجامدان ژ بۆ....

1. دەستنیشانکرنا ئەگەرێن پێشکەڤتن یان پاشکەڤتنا تەمەنێ پێگەهشتنێ ل دەڤ کچان.
2. دەستنیشانکرنا ئەگەرێن پاشکەڤتنا تەمەنێ پێگەهشتنێ ل دەڤ کوڕان.
3. دەستنیشانکرنا ئەگەرێن تێکچوونا زڤڕۆکا هەیڤانە.
4. دەستنیشانکرنا ئەگەرێن نەزوکیێ.
5. چاڤدێریکرنا چارەسەرییێن ژ بۆ نەزوکییێ هاتینەدان ب نەخۆشێ ل ژێر ڕاوێژ و چاڤدێرییا نۆژدارێن تایبەتمەندڤە.
6. چاڤدێریکرنا چارەسەرییێن ژ بۆ چوون بەرەڤ تەمەنێ بێئومێدییێ هاتینەدان ب نەخۆشێ ل ژێر ڕاوێژ و چاڤدێرییا نۆژدارێن تایبەتمەندڤە.

پشکنینا هۆرمۆنێ Estriol دهێتە ئەنجامدان ژ بۆ....

1. دەستنیشانکرنا ئاریشەیێن بۆماوەیی و زکماکی د ماوەیێ دووگیانبوونێدا.
2. چاڤدێریکرنا ئاریشەیێن د ماوەیێ دووگیانبوونێدا ڕوودەن.

تێبینی:

- پشکنینا Estradiol ب شێوەیەکێ تێر و تەسەل یا هاتییە بەحسکرن د لاپەڕێن داهاتیدا.

کەنگی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێن گرۆپێ Estrogens بهێنە ئەنجامدان؟

- دێ پێدڤی ب پشکنینا هۆرمۆنێ Estrone بی....

1. ل دەمێ هەبوونا ب زەحمەت دووگیانبوونێ.
2. ل دەمێ هەبوونا نیشانێن چوون بەرەڤ تەمەنێ بێئومێدیێدا وەکی خۆهدانا ب شەڤ و تێکچوونا زڤڕۆکا هەیڤانە و زێدەبوونا کێشا لەشی و گوهۆڕینا سرۆشتێ کەسی و هەبوونا ئاریشەیان ل دەمێ نڤستنێ و...هتد.
3. ل دەڤ کچان ل دەمێ پێشکەڤتن یان پاشکەڤتنا تەمەنێ پێگەهشتنێ.
4. هەبوونا خوینێ پشتی چوون بەرەڤ تەمەنێ بێئومێدییێ Menopause

5. ل دەمێ گیروبوونا تەمەنێ پێگەهشتنێ ل دەڤ کوڕان.
6. ل دەمێ هەبوونا سیفەتێن مێیینە ل دەڤ ڕەگەزێ مێ وەکی مەزنبوونا مەمکان و... هتد.

- دێ پێدڤی ب پشکنینا هۆرمۆنێ Estriol بی ئەگەر یا ب دووگیانبی....

1. ل دەمێ دووگیانبوونا ئافرەتێ نۆژدارا تایبەتمەند دێ داخوازا پشکنینا Estriol کەت دناڤبەرا هەفتییا ١٥ هەتا ٢٠ ژ دووگیانبوونێ، ژ بۆ ئاگەهدار بوون ژ ئاریشەیێن زکماکی و بۆماوەیی وەکی دیاردا داون Down Syndrome

مەرج نینە هەر ئافرەتەکا ب دووگیان پێدڤی ب پشکنینا هۆرمۆنێ Estriol ببیت، بەلێ پێدڤییە ئافرەتێن دووگیان یێن مەترسییا تووشبوونێ ب ئاریشەیێن زکماکی و بۆماوەیی ل دەڤ هەین ئەنجامبدەن، ژوان مەترسییان وەکی:

1. کەسێن ئاریشەیێن زکماکی و بۆماوەیی هەین دگەل مێژوویا خێزانێ.
2. ل دەمێ ئافرەتا دووگیان ژیێ وێ ژ ٣٥ سالییێ دەربازببیت.
3. ل دەمێ هەبوونا نەخۆشییا شەکرێ.
4. ل دەمێ هەبوونا هەوکرنێن ڤایرۆسی د ماوەیێ دووگیانبوونێدا.

هندەک ژ فاکتەرێن کارتێکرنێ ل ڕێژەیا هۆرمۆنێ ئیسترۆجین دکەن دناڤ لەشیدا:

1. دووگیانبوون.
2. ماوەیێ دووماهیکا دووگیانبوونێ.
3. چوون دناڤ تەمەنێ بێ ئومێدییێدا.
4. مەزنبوونا تەمەنی.
5. زێدەبوونا کێشا لەشی و قەلەوی.
6. هندەک ژ ئاریشەیێن بۆماوەیی و زکماکی وەکی Turner's Syndrome
7. بلندبوونا پەستانا خوینێ.
8. نەخۆشییا شەکرێ.
9. لاوازبوونا کارێ هێلکەدانێ.
10. هەبوونا کیسێ هێلکەدانێ PCOS
11. هەبوونا گرێیان د ڕژێنا ئەدرینال و هێلکەدانێدا.

بلندبوونا بەردەوام یا ڕێژەیا هۆرمۆنێ ئیسترۆجین دبیت مەترسیا تووشبوون ب چەندین ئاریشەیێن تەندرۆستی زێدەبکەت وەکی تووشبوون ب:

1. ئاریشەیێن گرێدایی ڕژێنا پەریزاد.
2. مەیینا خوینێ.
3. ژ کارکەڤتنا دلی.
4. جەلتە.
5. پەنجەشێرا سینگی.
6. پەنجەشێرا هێلکەدانێ.

ڕامانا ئەنجامێن پشکنینا هۆرمۆنێن گرۆپێ Estrogens:

- ل دەمێ ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینا هۆرمۆنێ Estrone بلندتر بیت ژ ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ..

1. هەبوونا گرێیان د (هێلکەدان، گونان، ڕژێنا ئەدرینال) دا بەلێ مەرج نینە ب تنێ گرێیێن پەنجەشێرێ بن.
2. هەوکرنا جگەرێ.
3. پێشکەڤتنا تەمەنێ پێگەهشتنێ ل دەڤ کچان.
4. پاشکەڤتنا تەمەنێ پێگەهشتنێ ل دەڤ کوڕان.

- ل دەمێ ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینا هۆرمۆنێ Estrone کێمتر بیت ژ ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ..

1. تووشبوون ب Primary Ovarian Insufficiency، دبیتە ئەگەرێ لاوازبوون و ڕاوەستیانا کارێ هێلکەدانێ بەری تەمەنێ ٤٠ سالییێ.
2. تووشبوون ب بارودۆخێ Turner Syndrome، بارودۆخەکە دبیتە ئەگەرێ دروست گەشەنەکرنا سیفەتێن جەستەیی و فسیولوجی یێن ئافرەتێ ب شێوەیەکێ دروست.

3. تووشبوون ب کیسێ هێلکەدانێ Polycystic Ovary Syndrome، ئێک ژ ئەگەرێن سەرەکییە ژ بۆ تووشبوون ب نەزوکییێ.

- ل دەمێ ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینا هۆرمۆنێ Estriol کێمتر بیت ژ ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ل دەمێ دووگیانبوونێ ئاماژەیە ژ بۆ..

1. نەمانا دووگیانبوونێ یان شەنسێ تووشبوون ب ئاریشەیێن زکماکی و بۆماوەیی یێ هەی.

**تێبینی:**

- د ڤان بارودۆخاندا پێدڤی زێدەتر پشکنینان هەیە ل ژێر ڕاوێژ و چاڤدێرییا نۆژدارێن تایبەتمەندڤە.

پشکنینا هۆرمۆنێن گرۆپێ Estrogens ب ڤان شێوازان دهێنە نڤیسین:

- Estrogen Levels Test
- Estrone (E1)
- Estradiol (E2)
- Estriol (E3)
- Estrogenic Hormone Test

## پشكنینا ئستڕادیۆل Estradiol (E2) Test

مفا ژ پشـــكنینا E2 دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەســـتنیشـــانكرنا ڕێژەیا هۆرمۆنێ Estradiol د ناڤ خوینێدا، هۆرمۆنێ Estradiol ب شێوەیەكێ سەرەكی ڕۆلێ هەی د گەشەیا جەستەیی و فیســـیۆلۆژی د هەردوو ڕەگەزاندا، د ژناندا ب ڕێژەیەكا زۆر ژ لایێ هێلكەدانێڤە دهێتە دەردان و بەرپرســـە ژ گەشـــەكرنا كۆئەندامێ زاوزێ و هەروەســـان هۆرمۆنێ Estradiol هاریكارییا دابەشـبوونا خانەیێن چەوریيان Fats دكەت د ناڤ لەشـیدا و هاریكارییا ڕاگرتنا تەندرۆسـتییا گەهـ و هەسـتییان دكەت، د زەلاماندا ژ لایێ ڕژێنا ئەدرینال و گونانڤە دهێتە دەردان و ڕێـژەیـا هـۆرمۆنێ E2 ب بەراوردكرن ل گەل ژنـان ڕێژەیـا وێ كێمترە، ژ بۆ دەستنیشانكرن و ئاگەهداربوونا ئاریشەیێن گرێدایی كۆئەندامێ زاوزێ و نەزۆكییێڤە نۆژدار پشكنینا هۆرمۆنێ Estradiol داخواز دكەت ب تایبەت ل دەڤ ژنان.

ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشكنینا هۆرمۆنێ E2:

| ڕەگەز | بارودۆخ | ڕێژەیێن ئاسایی | یەكە |
|---|---|---|---|
| نێر | | 10 - 50 | pg/mL |
| مێ | Premenopausal | 30 - 400 | pg/mL |
| مێ | Postmenopausal | 10 - 50 | pg/mL |



## بۆچی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ Estradiol بهێتە ئەنجامدان؟

ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:

1. ژ بۆ دەستنیشانکرنا هۆکارێن دەرنەکەڤتنا سیفەتێن جەستەیی و فیسیۆلۆژی.

ل دەڤ ڕەگەزێ مێ:

1. ژ بۆ دەستنیشانکرنا هۆکارێن دەرنەکەڤتنا سیفەتێن جەستەیی و فیسیۆلۆژی.
2. ژ بۆ دەستنیشانکرنا هۆکارێن گیرۆبوونا زڤڕۆکا هەیڤانە ل دەڤ کچان.
3. ژ بۆ دەستنیشانکرنا ئەگەرێن تێکچوونا زڤڕۆکا هەیڤانە.
4. ژ بۆ دەستنیشانکرنا هۆکارێن نەزۆکییێ.
5. ژ بۆ چاڤدێریکرن و ئاگەهداربوون ژ تەندرۆستییا هێلکەدانێ.
6. ل دەمێ هەبوونا نیشانێن پەنجەشێرا هێلکەدانێ وەکی: (هەستکرن ب تێربوونێ پشتی خوارنا ڕێژەکا کێم ژ خوارنێ، وەرمتنا زکی، هەبوونا ئێشانێ ل ناوچەیا حەوزێ، کێمبوونا کێشا لەشی، زێدەبوونا جارێن میزکرنێ، ...هتد).
7. ل دەمێ دەرکەڤتنا نیشانێن تەمەنێ بێئومێدییێ.
8. ل دەمێ دیتن و هەبوونا خوینا نەئاسایی پشتی چوون دناڤ تەمەنێ بێئومێدییێدا.
9. پشتی وەرگرتنا چارەسەرییێ ژ بۆ ئاگەهداربوون ژ کارتێکرنا دەرمانێن هاتینە بکارهینان ژ لایێ نەخۆشێڤە.

## هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ Estradiol د ناڤ لەشیدا:

1. هەبوونا گرێیان د هێلکەدان و گوناندا.
2. کارکرنا ڕژێنا پەریزاد زێدەتر ژ یا لەش پێدڤی Hyperthyroidism
3. هەبوونا ئاریشەیان د جگەرێدا وەکی بارودۆخێ Cirrhosis
4. کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ نێرینە Testestrone ل دەڤ زەلامان.
5. گیرۆبوونا گەشەیا جەستەیی و فیسیۆلۆژی ل دەڤ کوڕان.
6. مەزنبوونا مەمکان ل دەڤ زەلامان Gynecomastia

## هۆکارێن دبنە ئەگەرێ کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ Estradiol د ناڤ لەشیدا:

1. چوون د ناڤ تەمەنێ بێئومێدییێدا Menopause
2. هەبوونا نەخۆشیێن بۆماوەیی وەکی Turner Syndrome

3. هەبوونا کیسێ هێلکەدانێ Polycystic Ovarian Syndrome (PCOS) دبیت ببیتە ئەگەرێ نەزۆکییێ ل دەڤ ژنان.
4. لاوازبوونا کارێ ڕژێنا ژێرمێشکی Hypopituitarism
5. لاوازبوونا هێلکەدانێ یان گونان ژ بۆ دەردانا ڕێژەیا پێدڤیا هۆرمۆنی Hypogonadism
6. ژ کارکەڤتنا کارێ هێلکەدانێ ژ بەری چوونا بەرەڤ تەمەنێ بێئومێدییێ Premature Menopause دا.

هندەك ژ دەرمانێن کارتێکرنێ ل ڕێژەیا هۆرمۆنێ Estradiol دکەن د ناڤ لەشیدا:

- Birth control pills
- Estrogen therapy
- Glucocorticoids
- Phenothiazines
- Antibiotics tetracycline (Panmycin) and ampicillin

پشکنینا هۆرمۆنێ E2 ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Estradiol Test
- E2 Test

Blood Test: Estradiol

## پشکنینا هۆرمۆنێ Anti-Müllerian Hormone Test - AMH

مفا ژ پشـــکنینا AMH دهێته وەرگرتن ژ بۆ دەســـتنیشـــانکرنا ڕێژەیا هۆرمۆنێ Anti-Müllerian Hormone د نـاڤ خوینێـدا، هۆرمۆنێ AMH ژ لایێ کۆئەنـدامێ زاوزێڤە ل دەڤ هەردوو ڕەگەزان دهێته دەردان، ل دەڤ ڕەگەزێ مێ ژ لایێ هێلکەدانێڤە، هەروەسان ل دەڤ ڕەگەزێ نێر ژ لایێ گوناڤە دهێته دەردان، ڕۆلێ هۆرمۆنێ AMH ب شـــێوەیەکێ ئـاســـایی پترییا جاران ل دویڤ ڕەگەز و ژییێ کەســـی دمینیت، د ڕەگەزێ نێردا ل دەمێ زارۆک زۆر بچویك د زکێ دایکێدا ئەڤ هۆرمۆنە دبیتە ئەگەرێ گەشەیا گونان و ڕێگرییێ ل دروستبوونا ئەندامێ مێیینە دکەت، هەروەسان بەروڤاژی ژ بۆ ڕەگەزێ مێ، ژمارەیا هێکان د ژنەکا ئاساییدا یا سنۆردارە و د هەر 28 ڕۆژاندا هێکەك گەشە دکەت و ئامادە دبیت ژ بۆ پیتاندنێ ب شێوەیەکێ ئاسایی هەتا ئەڤ پرۆسـەیە بهێتە ئەنجامدان پێدڤی ب پالپشـتییا هنـدەك هۆرمۆنێن دیترە ژ وان هۆرمۆنێن FSH , LH (هەردووک پشـــکنینێن هۆرمۆنێن ئـاماژە پێکری هاتیینە بەحســـکرن و شرۆڤەکرن ب شـــێوەیەکێ تێر و تەســـەل د لاپەڕێن بۆریـدا)، هنـدی ڕێژەیـا هۆرمۆنێ AMH یـا جێگیر بیت ئاماژەیە ژ بۆ تەندرۆســـتبوون و پێگەهشـــتنا هێکان، ڕێژەیا هۆرمۆنێ AMH پەیوەندییا ڕاســـتەوخۆ یا هەی ب شـــیانێن هێلکەدانێڤە ژ بۆ دروســـتکرنـا هێکـان، کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ AMH پشـــتی تەمەنێ بێئومێدییێ ب ئاسایی دهێتە هژمارتن.

ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا هۆرمۆنێ AMH:

| بارودۆخ | ڕێژەیێن ئاسایی | یەکە |
|---|---|---|
| ڕێژەیا ئاسایی | هەتا 1 | ng/ml |
| کێمتر ژ ڕێژەیا ئاسایی | 0.7 - 0.9 | ng/ml |
| ڕێژەیا کێم | 0.3 - 0.6 | ng/ml |
| ڕێژەیا گەلەك کێم | کێمتر بیت ژ 0.3> | ng/ml |



**کەنگی و بۆچی پێدڤییە پشـــکنینا هۆرمۆنێ Anti-Müllerian Hormone (AMH) بهێتە ئەنجامدان:**

- دێ پێدڤی پشـکنینا AMH بی ل دەمێ هەبوونا ب زەحمەت دووگیانبوونێ، پشکنینا AMH هـاریکـارە ژ بۆ دەســـتنیشـــانکرنا هەبوونا دەلیڤەیا دووگیانبوونێ، بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنی ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا ڕێژەیەکا باش ژ هێکان و بەرسڤدانەکا باشە ژ بۆ چـارەســـەرییێ، کێمبوونـا ڕێژەیـا هۆرمۆنی ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا ڕێژەیەکا کێم ژ هێکان و بەرسڤدانەکا نەیا باشە ژ بۆ چارەسەرییێ.
- هەروەسـا دبیت تو پێدڤی پشـکنینا هۆرمۆنێ AMH ببی ل دەمێ هەبوونا نیشـانێن کیسێ هێلکەدانێ ل دەڤ ژنان Polycystic Ovary Syndrome (PCOS)

ژ نیشانێن هەبوونا کیسێ هێلکەدانێ PCOS ل دەڤ ڕەگەزێ مێ:

1. تێکچوونا زڤڕۆکا هەیڤانە.
2. بچویکبوونا قەبارەیێ مەمکان.
3. هەبوونا پرسکان ل سەر پیستی.
4. بلندبوونا کێشا لەشی.
5. ب زەحمەت دووگیانبوون.



- هەروەســـان ژ بۆ دیارکرنا هندەك ژ جۆرێن پەنجەشـــێرا هێلکەدانێ مفا ژ پشـــکنینا هۆرمۆنێ AMH دهێتە وەرگرتن، ژ بەر کو هـاریکـارە ژ بۆ چـاڤـدێریکرنـا بارودۆخێ نەخۆشییێ و کارتێکرنا دەرمانان.

- ژ بۆ دەستنیشانکرنا چالاکییا هێلکەدانێ.

- ژ بۆ زانینا شیانێن دووگیانبوونێ ب تایبەت ئەو ژنێن زارۆکێن بلووری دچینن.

پشکنینا هۆرمۆنێ AMH ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Anti-Müllerian Hormone Test
- AMH Test
- AMH

## AMH over time




Source: Median AMH levels between the ages of 25 and 40, as reported in one study by Fertility and Sterility

## پشکنینا ترۆپۆنین I - Troponin I Test

مفا ژ پشکنینا Troponin I دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڕێژەیا ئێک ژ پرۆتینێن گرۆپێ Troponins د ناڤ خوینێدا، پرۆتینێن گرۆپێ ترۆپۆنین دهێنە دیتن د ناڤ ماسۆلکەیێن دلیدا Cardiac-Specific Troponin ، ل دەمێ ماسۆلکەیێن دلی تووشی زەبرەکێ دبن پرۆتینێ ترۆپۆنین دڕێژیتە د ناڤ زڤڕۆکا خوینێدا وەکی ل دەمێ دل تووشی زیانێ دبیت ڕێژەیەکا باش ژ پرۆتینی دڕێژیتە د ناڤ خوینێدا، مفا ژ پشکنینا ترۆپۆنین دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا دەستپێکا نەخۆشیێن گرێدایی دلی و ب تایبەت جەلتەیا دلی، بلندبوونا ڕێژەیا ترۆپۆنینی د ناڤ خوینێدا ئاماژەیەکا بهێزە ژ بۆ هەبوونا زیان گەهاندن ب دلی و جەلتەیا دلی ئەگەر بلەز نەهێتە چارەسەرکرن مەترسییەکا مەزن دێ ل سەر ژیانا نەخوشی پەیدا بیت دویر نینە ببیتە ئەگەرێ مرنێ.

تێبینی: هندەك جاران ئەو کەسێن نەخۆشییا Angina هەی پشکنینا ترۆپۆنینی بۆ دهێتە ئەنجامدان، نەخۆشییا Angina چییە؟ سەرهلددەت ل دەمێ نەگەهشتنا ڕێژەیا پێدڤییا خوینێ ژ بۆ دلی.

ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا Troponin I:

- هەتا 0.3 ب یەکەیا ng/ml



### جۆرێن پرۆتینێن گرۆپێ Troponins:

1. Troponin C
2. Troponin T
3. Troponin I




### جەلتەیا دلی چییە:

جەلتەیا دلی ڕامانا بریندراربوون و زیان بەرکەڤتن یان مرنا بەشـەك ژماسـۆلکەیێن دلییە، ب شێوەیەکێ گشتی جەلتەیا دلی ژ بەر گرتنا ئێك ژ خوینبەرێن دلی Coronary Arteries دهێتە ڕویـدان، دبیت ژ بەر مەیینا خوینێ یان نیشـتنا چەوریيان ب دیوارێن خوینبەرانڤە ببیتە ئەگەرێ ڕەقبوون و گرتنا بۆرییێن خوینێ و نەگەهشـتنا خۆراك و ئۆکسـجینا پێدڤی ژ بۆ خانەیێن دلی.

ژ نیشانێن هەبوونا جەلتەیا دلی:

1. سینگئێشان.
2. هەستکرن ب پەستان و نەئارامبوونێ ل دەمێ هەناسەدانێ.
3. هەلاڤێتن.

4. هەستکرن ب گێژبوونێ.
5. بلەز لێدانا لێدانێن دلی.
6. هەبوونا ئێشانێ ل هندەك ئەندامێن دیتر یێن لەشی وەکی گەدە و پشت و مل.
7. خوهدان.




**Heart Attack**

کینە ئەو کەسێن مەترسییا تووشبوونێ ب جەلتەیا دلی ل دەڤ هەی:

1. کەسێن بلندبوونا پەستانا خوینێ ل دەڤ هەی.
2. کەسێن جگارکێش.
3. کەسێن نەخۆشییا شەکرێ هەی.
4. کەسێن بلندبوونا ڕێژەیا کۆلسترۆلی ل دەڤ هەی.
5. کەسێن بەردەوام ڤەخوارنێن کحۆلی بکاردهینن.
6. کەسێن خوارنێن زێدە ب خوێ و چەوری دخۆن.
7. کەسێن قەلەو و نەکرنا وەرزشێ.
8. هەبوونا مێژوویا خێزانێ(بۆماوەیی) ل گەل نەخۆشییێن دلی.

## دێ چاوا مەترسییێن تووشبوونێ ب جەلتەیا دلی کێم کەی:

1. ب کونترۆلکرنا پەستانا خوینێ Blood Pressure
2. ب کونترۆلکرنا ڕێژەیا بلند یا کۆلسترۆلی.
3. ب کونترۆلکرنا کێشا لەشی.
4. خوارنا خوارنێن تەندرۆست و دویرکەڤتن ژ خوارنێن دەولەمەند ب چەورییان ب تایبەت ئەگەر د سەر تەمەنێ 40 سالییێدا بی یان ل دەمێ هەبوونا مێژوویا خێزانێ ل گەل نەخۆشییێن دلی.
5. دویرکەڤتن ژ ڤەخوارنا بەردەوام یا کحۆلێ یان کێمکرنا وێ.
6. دویرکەڤتن ژ جگارە کێشانێ.
7. دویرکەڤتن ژ سترێسێ.
8. وەرزشکرن ب تایبەت ژ بۆ کەسێن ب تەمەن.

ژ بۆ کێمکرنا مەترسییا تووشبوونێ ب جەلتەیا دلی باشترە شێوازێ ژیانێ ب شێوەیەکێ باش و ڕێکئێخستی بیت.



## کەنگی و بۆچی پێدڤییە پشکنینا Troponin I بهێتە ئەنجامدان:

ب گشتی پشکنینا ترۆپۆنین بۆ ئەو کەسێن ژ نشکەکێڤە رەوشا تەندرۆستییا وان تێکدچیت و دهێنە رەوانەکرن بۆ بەشێ تەنگاڤییان ل نەخۆشخانەیێ، پشتی دیتنا نەخۆشی ژ لایێ نۆژداریڤە و ل دەمێ هەبوون و دەرکەڤتنا نیشانێن جەلتەیا دلی پشکنینا Troponin دهێتە داخوازکرن ژ لایێ نۆژداریڤە ژ بۆ پشتڕاستبوون ژ تەندرۆستبوونا دلی و دەستنیشانکرنا نەخۆشییێ و پشتی دەرکەڤتنا ئەنجامێن پشکنینێ و هەبوونا رێژەیا بلند یا ترۆپۆنینی (دبیت د چەند دەمژمێراندا چەند جارەکان پشکنین بهێتە دووبارەکرن بۆ چاڤدێریکرنا بلندبوون و کێمبوونا رێژەیا ترۆپۆنینی) د ناڤ خوینێدا.

## رامانا ئەنجامێن پشکنینا Troponin I:

بلندبوونا ئەنجامێ پشکنینێ ل دەڤ کەسێن نیشانێن هەبوونا جەلتەیا دلی ل دەڤ وان هەی ئاماژەیەکا بهێزە ژ بۆ هەبوونا جەلتەیا دلی یان هەبوونا ئاریشەیێن تەندرۆستی د دلیدا رادگەهینیت، رێژەیا ئاسایی یا پرۆتینی د 3 بو 6 دەمژمێراندا پشتی دەرکەڤتنا نیشانان بلند دبیت و هەتا نێزیکی 10 بۆ 14 رۆژان ب بلندی دمینیت (هەر ژ بەرهندێ پێدڤییە د ڤی دەمیدا چەند جارەکان ئەڤ پشکنینە بهێتە پشتڕاستکرن)، بەلێ ب تنێ ئەڤ پشکنینە بەس نینە ژ بۆ دەستنیشانکرنا بارودۆخێ نەخۆشی، پێدڤی پشکنینێن فیزیکییە، هەروەسا نۆژدارێ تایبەتمەند دێ داخوازا هێلکارییا دلی کەت و پێدڤییە مێژوویا نەخۆشی ل گەل ئەندامێن خێزانێ ژ بۆ نەخۆشییێن گرێدایی دلی بزانیت.

- رێژەیا پشکنینێ د چەند بارودۆخێن دیتردا ژ نەخۆشییێن دلی وەکی (Congestive Heart Failure) (Myocarditis) ئەگەرێ بلندبوونێ یێ هەی.



## پشکنینێن پەیوەندیدار ب پشکنینا Troponin I ڤە:

1. Myoglobin
2. CK-MB
3. Echocardiogram (Ultrasound of the heart)
4. Chest X-ray
5. CT scan
6. ECG

## پشکنینا Troponin ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Troponin I Test
- Cardiac Troponin I (cTnI) Test
- Cardiac Troponin T (cTnT) Test
- Cardiac Troponin (cTN) Test
- Cardiac-Specific Troponin I and Troponin T Test



## پشکنینا ئاسنێ کۆگەهکری Ferritin Test

مفا ژ پشکنینا ئاسنێ کۆگەهکری دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڕێژەیا Ferritin د ناڤ خوینێدا، Ferritin پرۆتینەکە ب شێوەیێ ئاسنێ کۆگەهکری د ناڤ لەشیدا دهێتە دیتن و ل دویڤ پێدڤییا لەشی دهێتە بکارهینان، ڕێژەیەکا زۆر ژ Ferritin ی د ناڤ خانەیێن لەشیدا هەیە د بارودۆخێن ئاساییدا ب تنێ ڕێژەیەکا کێم دڕێژیتە د ناڤ زڤڕۆکا خوینێدا، ئاسن ب پێدڤی و گرنگ دهێتە دانان ژ بۆ دروستبوونا خرۆکێن سۆرێن خوینێ و ژ کارێن سەرەکی یێن خرۆکێن سۆرێن خوینێ ڤەگوهستنا ئۆکسجینێیە ژ بۆ لەشی هەمییێ.

ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا ئاسنێ کۆگەهکری:

- ل دەڤ ڕەگەزێ نێر: 24 - 336 micrograms per liter
- ل دەڤ ڕەگەزێ مێ: 11 - 307 micrograms per liter



**نیشانێن بلندبوونا ڕێژەیا ئاسنێ کۆگەهکری Ferritin د ناڤ لەشیدا:**

1. ئێشانا گەدەی.
2. ئێشانا گەهان.
3. سینگئێشان.
4. هەستکرن ب لاوازبوونێ بێی ئەگەرەک دیارکری.
5. هەستکرن ب ماندیبوونێ بێی ئەگەرەک دیارکری.
6. لاوازبوونا ماسۆلکەیان.
7. وەریانا پرچێ.

**نیشانێن کێمبوونا ڕێژەیا ئاسنێ کۆگەهکری Ferritin د ناڤ لەشیدا:**

1. هەستکرن ب لاوازبوونێ بێی ئەگەرەک دیارکری.
2. هەستکرن ب ماندیبوونێ بێی ئەگەرەک دیارکری.
3. سەرئێشانا بەردەوام و دۆمدرێژ.
4. زەنگلێدان د گوهیدا.
5. ئێشانا پێیان.
6. لەرزین.
7. هەبوونا ئاریشەیان ل دەمێ هەناسەدانێ.
8. بلەز لێدانا لێدانێن دلی.



**هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا ئاسنێ کۆگەهکری Ferritin د ناڤ لەشیدا:**

1. هەوکرنا گەهان.
2. کارکرنا ڕژێنا پەریزاد زێدەتر ژ یا پێدڤی Hyperthyroidism
3. نەخۆشییا Adult-onset Still's
4. نەخۆشییا شەکرێ ژ جۆرێ 2.
5. پەنجەشێرا خوینێ Leukemia
6. ژەهراویبوون ب ئاسنی.
7. ڤەگوهاستنا خوینێ.
8. نەخۆشییێن گرێدایی جگەرێ وەک هەوکرنا دۆمدرێژ یا ڤایرۆسێ جگەرێ ژ جۆرێ C
9. Restless Leg Syndrome
10. Hemochromatosis
11. Hodgkin's lymphoma

**ڕامانا ئەنجامێن پشکنینا ئاسنێ کۆگەهکری:**

- کێمبوونا ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینا Ferritin کێمتر ژ ڕێژەیا ئاسایی ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا تووشبوون ب کێم خوینییێ Anemia ژ ئەگەرێ کێمبوونا توخمێ ئاسنی (IDA) Iron Deficiency Anemia و ژ بەربەلاڤترین ئەگەرێن کێم خوینییێیە ل دویڤ پێدڤییا لەشی خرۆکێن سۆرێن خوینێ ناهێنە دروستکرن، تووشبوون ب کێم خوینییێ ژ ئەگەرێ کێمییا ئاسنی دبیتە ئەگەرێ هەبوونا ئاریشەیێن دلی و هەوکرنان.

- بلندبوونا ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینا Ferritin ژ ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئانکو ڕێژەیەکا بلند ژ توخمێ ئاسنی هەبوون یا د ناڤ لەشیدا هەی و ژ پێدڤییا لەش پێدڤی زێدەترە.

Blood Test: Ferritin (Iron)

**هندەك ژ سەرچاوەیێن دەولەمەند ب توخمێ ئاسنی:**

- مریشك.
- ماسی.
- گۆشتێ سۆر.
- برۆكلی، سپیناخ، كەرەفس.
- شتی.
- زەركا هێكێ.
- چەرەزات.
- خوارنا جگەرێ، بەلێ ئەگەر ژن یا ب دووگیان بیت نابیت بخۆت.




**پشكنینا ئاسنێ كۆگەهكری ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:**

- Ferritin Test
- Ferritin
- Serum Ferritin
- Serum Ferritin Test
- Serum Ferritin Level Test
- Ferritin Serum Test

## پشکنینا هۆرمۆنێ ئەلدۆسترۆن Aldosterone (ALD) Test

پشکنینا ALD دهێتە ئەنجامدان و مفا ژێ دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڕێژەیا هۆرمۆنێ Aldosterone د ناڤ خوینێ یان میزێدا، هۆرمۆنێ Aldosterone دهێتە دەردان ژ لایێ ڕژێنا Adrenal Glands ڤە ، Adrenal Glands چییە؟ دوو ڕژێنێن بچویکن دکەڤنە د سەر گولچیسکاندا. ژ کارێن سەرەکییێن هۆرمۆنێ ALD هاریکارییا کونترۆلکرنا پەستانا خوینێ و ڕێکئێخستنا هەردوو توخمێن سۆدیووم و پۆتاسیووم د ناڤ خوینێدا دکەت، سۆدیووم و پۆتاسیووم ژ ئەلکترۆلایتان دهێنە هژمارتن و ئەلکترۆلایت ژ خوێ و کانزایان پێکدهێن، ژ بۆ لەشی د گرنگن چەندین فەرمانێن گرنگ د ناڤ لەشیدا ئەنجام ددەن وەکی پاراستنا لەشی ژ هشکبوونێ، بەلانسا ڕێژەیا ترش و تفتان د لەشیدا دکەن، هاریکارییا کارێ ماسۆلکەیان و بەلانسا کارێ دەمارەخانەیان دکەن و ...هتد. هەر بلندبوون یان کێمبوونەک د ڕێژەیا ئاسایی یا هۆرمۆنێ Aldosterone دا پەیدا ببیت ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا چەندین ئاریشەیێن تەندرۆستی.




labpedia.net

**بۆچی پێدڤییە پشکنینا پشکنینا هۆرمۆنێ Aldosterone بهێتە ئەنجامدان:**

1. ژ بۆ دەستنیشانکرنا Primary or Secondary Aldosteronism ئەڤ ئاریشە پەیدا دبیت ل دەمێ ڕژێنا Adrenal Glands زێدەتر ژ یا لەش پێدڤی دەست ب دروستکرنا هۆرمۆنێ Aldosterone دکەت.
2. هاریکارییا دەستنیشانکرنا ئاریشەیێن Adrenal insufficiency دکەت ل دەمێ ڕژێنا Adrenal Glands ڕێژەیا پێدڤی یا لەشی ژ هۆرمۆنێ Aldosterone دروست نەکەت.
3. ژ بۆ پشکنینکرنا گرێیێن د ڕژێنا Adrenal Glands دا هەین.
4. ژ بۆ دەستنیشانکرنا ئەگەرێن بلندبوونا پەستانا خوینێ.




- **Adrenal Glands** دوو ڕژێنێن بچویکن دکەڤنە د سەر گولچیسکاندا.

**کەنگی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ Aldosterone بهێتە ئەنجامدان:**

ل دەمێ هەبوونا نیشانێن بلندبوون یان کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ ALD بهێتە ئەنجامدان.

نیشانێن بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ Aldosterone د ناڤ لەشیدا:
1. هەستکرن ب ماندیبوونێ.
2. بەردەوام تێهنیبوون.
3. زێدەبوونا جارێن میزکرنێ.
4. گرژبوونا ماسولکەیان.

نیشانێن کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ Aldosterone د ناڤ لەشیدا:
1. کێمبوونا کێشا لەشی.
2. هەستکرن ب ماندیبوونێ.
3. لاوازبوونا ماسولکان.
4. زکئێشان Abdominal Pain
5. کێمبوونا پەستانا خوینێ.
6. هەلاڤێتن.
7. زکچوون.
8. کێمبوونا موییێن لەشی.

هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ Aldosterone د ناڤ لەشیدا:
1. ژ کارکەڤتنا دلی.
2. نەخۆشییێن گرێدایی گولچیسکان یان ژ کارکەڤتنا وان.
3. هەوکرنا جگەرێ.
4. خوارنا سەرچاوەیێن ژ ڕێژەیەکا کێم ژ سۆدیوومی پێکدهێن.
5. بارودۆخێ Cushing's Syndrome

هۆکارێن دبنە ئەگەرێ کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ Aldosterone د ناڤ لەشیدا:
1. نەخۆشییا Addison's Disease (د لاپەرێن چوویدا هاتییە بەحسکرن).
2. خوارنا سەرچاوەیێن دەولەمەند ب سۆدیوومی.
3. Adrenal insufficiency ل دەمێ ڕژێنا ئەدرینال ڕێژەیا پێدڤی یا لەشی ژ هۆرمۆنێ Aldosterone دروست نەکەت.
4. Congenital Adrenal Hyperplasia

هندەك ژ دەرمانێن كارتێكرنێ ل ڕێژەیا هۆرمۆنێ Aldosterone دكەن د ناڤ لەشیدا:

- Nonsteroidal anti-inflammatory drugs (NSAIDs), such as ibuprofen
- Diuretics (water pills)
- Oral Contraceptives (birth control pills)
- Angiotensin-converting enzyme (ACE) inhibitors, such as benazepril
- Steroids, such as prednisone
- Beta blockers, such as bisoprolol
- Calcium hannel blockers, such as amlodipine
- Lithium
- Heparin
- Propranolol

هندەك ژ سەرچاوەیێن دەولەمەند ب سۆدیوومی:

- مریشك.
- گێزەر.
- زەیتوون.
- سپیناخ.
- كەرەفس.
- ماسیا سەردین.

هندەك ژ سەرچاوەیێن دەولەمەند ب پۆتاسیوومی:

- سپیناخ.
- برۆكلی.
- باهیڤ.
- ئەڤۆگادروو.

- مشمش و کیڤی و پرتەقال.
- باجان.
- شیر و ماست.
- پتات.



پشکنینێن پەیوەندیدار ب پشکنینا هۆرمۆنێ Aldosterone ڤە:

1. Plasma Renin
2. Andrenocorticotropin (ACTH) infusion
3. Captopril Challenge Test
4. Intravenous (IV) saline infusion
5. CT scan of abdomen to look at Adrenal Gland

پشکنینا هۆرمۆنێ Aldosterone ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Aldosterone Test
- ALD Test
- Serum Aldosterone
- Aldosterone in urine
- Aldosterine in Blood



## پشکنینا ڕێنین Renin Test

مفا ژ پشکنینا Renin دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڕێژەیا هۆرمۆنێ ڕێنین دناڤ خوینێدا، هۆرمۆنێ ڕێنین ژ لایێ گولچیسکانڤە دهێتە دەردان، هەروەسا کۆنترۆلا هۆرمۆنەکێ دیتر دکەت ب ناڤێ Aldosterone (پشکنینا هۆرمۆنێ Aldosterone هاتییە بەحسکرن و شرۆڤەکرن ب شێوەیەکێ تێر و تەسەل د لاپەڕێن چووییدا) و دهێتە دەردان ژلایێ ڕژێنێن ئەدرینالڤە(ئەدرینال گلاند دوو ڕژێنێن بچویکن دکەڤنە د سەر گولچیسکاندا)، هۆرمۆنێ Aldosterone هاریکارییا پەستانا خوینێ دکەت و بەلانسا ڕێژەیا پوتاسیووم و سۆدیوومی دناڤ لەشیدا دکەت، هەردووک هۆرمۆن پێکڤە کاردکەن هەر ژبەر هندێ ل دەمێ نەئاساییبوونا ڕێژەیا Renin یان Aldosterone ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا ئاریشەیێن گرێدایی ڕژێنێن ئەدرینالڤە.

ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا هۆرمۆنێ Renin:

- 0.25 - 5.82 ng/mL/hr



## بۆچی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنی ڕێنین بهێتە ئەنجامدان؟

پتریا جاران دهێتە ئەنجامدان ژ بۆ زانینا ڕەوشا ڕژێنین ئەدرینال ئەرێ زێدە یان کێم هۆرمۆنی (Renin - Aldosterone) دەرددەن، و هەروەسا ژ بۆ دەستنیشانکرنا بارودۆخێ Primary Aldosteronism (PA)، PA پەیدادبیت ل دەمێ دەردانا ڕێژەیەکا زۆر ژ ئەلدۆسترۆنی، هەروەسا دهێتە نیاسین ب Primary Hyperaldosteronism، هەروەسا دیاردا کۆن و ئەگەرێن بلندبوونا پەستانا خوینێ، ل دەمێ بلندبوونا پەستانا خوینێ بۆ ماوەیەکێ درێژ و نەهێتە چارەسەرکرن ل ژێر چاڤدێری و ڕاوێژا نۆژدارێن تایبەتمەندڤە دشیانێن بلندبوونا پەستانا خوینێدا هەیە مەترسییێن تووشبوون ب جەڵتە، ژ کارکەڤتنا دلی و گولچیسکان زێدە بکەت.

باشترە ل دەمێ ئەنجامدانا پشکنینا هۆرمۆنێ ڕێنین بۆ ماوەیێ ١٤ هەتا ٢٨ ڕۆژان دویربکەڤی ژ ب کارهینانا دەرمانێن:

- Birth control pills
- Blood pressure medicines
- Diuretics (water pills)

**تێبینی:**

- ب کارهینان و ب کارنەهینانا دەرمانان پێدڤییە ل ژێر ڕاوێژ و چاڤدێرییا نۆژدارێن تایبەتمەندڤە بیت.

رامانا ئەنجامێن پشکنینا هۆرمۆنێ Renin:

- ل دەمێ کێمبوونا رێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ و کێمتر بیت ژ رێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ دبیت ئاماژە بیت ژ بۆ هەبوونا....

1. Primary aldosteronism (PA)
2. نەخۆشیێن گرێدایی گولچیسکان.

- ل دەمێ بلندبوونا رێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ و بلندتر بیت ژ رێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ دبیت ئاماژە بیت ژ بۆ هەبوونا....

1. نەخۆشیا ئەدیسون (د لاپەرێن چوونیدا هاتییە بەحسکرن و شرۆڤەکرن).
2. هشکبوونێ.
3. نەخۆشیێن گرێدایی جگەرێ.

- پتریا جاران ئەنجامێ پشکنینا هەردووک هۆرمۆنێن رێنین و ئەڵدوسترۆن پێکڤە دهێنە بەراوردکرن ب ڤی شێوەیی..

1. کێمبوونا رێژەیا ئەنجامێ پشکنینا هەردووک هۆرمۆنان ژ رێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا بارودۆخێ Cushing's syndrome، Cushing's syndrome بارودۆخەکە رژێنین ئەدرینال زێدەتر ژ پێدڤییا لەشی هۆرمۆنێ کۆرتیزۆڵ بەرهەمدهینن.

2. کێمبوونا رێژەیا هۆرمۆنێ رێنین و بلندبوونا رێژەیا هۆرمۆنێ ئەلدۆسترۆن ژ رێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ تووشبوونێ ب بارودۆخێ PA

3. بلندبوونا رێژەیا هۆرمۆنێ رێنین و کێمبوونا رێژەیا هۆرمۆنێ ئەڵدۆسترۆن ژ رێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ تووشبوونێ ب نەخۆشیا ئەدیسون.

4. بلندبوونا رێژەیا هۆرمۆنێ رێنین و بلندبوونا رێژەیا هۆرمۆنێ ئەڵدۆسترۆن ژ رێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ تووشبوونێ ب Secondary Aldosteronism

## پشکنینا هۆرمۆنێ ڕێنین ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Renin Test
- Renin Blood Test
- Plasma renin activity Test
- PRA
- Aldosterone-renin ratio Test
- ARR



## پشکنینا هۆرمۆنێ گەشەیێ Growth Hormone Test

ب ڕێکا خوینێ مفا ژ پشکنینا هۆرمۆنێ گەشەیێ دهێتە وەرگرتن ژ بۆ هندێ پێزانینان وەربگرین ئەرێ لەش ڕێژەیا ئاسایی ژ هۆرمۆنێ GH دروست دکەت یان نە، GH دهێتە بەرهەمهینان ژ لایێ ڕژێنا ژێر مێشکیڤە، ڕژێنا ژێر مێشکی چییە؟ ڕژێنەکا بچویکە دکەڤیتە ژێر مێشکیدا، پشکنینا Growth Hormone دهێتە نیاسین ب پشکنینا هۆرمۆنێ گەشەکرنێ ل دەڤ مرۆڤان، GH کونترۆلا گەشەیا لەشی دکەت و هەروەسا هاریکارییا کونترۆلا میتابۆلیزمێن لەشی دکەت و پرۆسەیا چەوانییا ب کارهینانا خۆراک و وزەیا لەشی.




د زارۆکاندا هۆرمۆنێ GH ڕۆلەکێ گرنگ دگێریت دگەشەیا هەستیکان و گەشەکرنا بارستەیا ماسۆلکەیان و بلنداهییێ، د زارۆک و مەزناندا ل دەمێ کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ GH دێ بیتە ئەگەرێ هەبوونا کێشەیێن تەندرۆستی.

ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا هۆرمۆنێ گەشەیێ ل دەڤ پێگەهشتییان:

| پشکنین | ڕەگەز | ڕێژەیا ئاسایی | یەکە |
|---|---|---|---|
| GH | نێر | 0.4 - 10 | ng/mL |
| GH | مێ | 1 - 14 | ng/mL |

## بۆچی پشکنینا هۆرمۆنێ گەشەیێ GH دهێتە ئەنجامدان؟

1. ل دەمێ کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ GH: د زارۆکاندا هۆرمۆنێ گەشەیێ GH ب پێدڤی دهێتە زانین ژ بۆ پێگەهشتن و گەشەیا ئاسایی یا زارۆکی، کێمیا هۆرمۆنێ گەشەیێ دشێت ببیتە ئەگەرێ گەشەکرنا زارۆکی ب هێواش(هێدی)ی و کورتتر ژ زارۆکێن ئاسایی و تەندرۆست یێن هەمان تەمەن هەی، د مەزناندا کێمیا هۆرمۆنێ GH دبیتە ئەگەرێ کێمبوونا چڕیا هەستییان و کێمبوونا ڕێژەیا بارستەیا ماسۆلکەیان.

2. بارودۆخێ Gigantism: بارودۆخەکێ دەگمەنە د ژییێ زارۆکینیێدا رویددەت د بیتە ئەگەرێ زێدە بەرهەمهینانا هۆرمۆنێ GH د ناڤ لەشیدا، کەسێن تووشبووی ب بارودۆخێ Gigantism ئەو کەس زۆر د مەزنن ژ لایەنێ لەشیڤە د ژییەکێ زویدا ب بەراوردکرن دگەل کەسێن هەمان تەمەن هەی و دەست و پێیێن وان دمەزنترن.

3. بارودۆخێ Acromegaly: نەخوشییەکە تووشی مەزنان دبیت، دبیتە ئەگەر لەش ڕێژەیەکا زۆر ژ هۆرمۆنێ گەشەیێ بەرهەم بینیت، کەسێن پێگەهشتی و نەخوشیا Acromegaly ل دەڤ هەی هەستییێن وان مەزنترن ژ ڕێژەیا ئاسایی، و هەروەسا دەست و پێ و سەروچاڤێن وان مەزنترن ژ کەسێن ئاسایی.

4. هەروەسا ژ بۆ هندەک بارودۆخێن گرێدایی ڕژێنا ژێر مێشکی دهێتە ب کارهینان و ئەنجامدان.

## کەنگی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ گەشەیێ بهێتە ئەنجامدان؟

ل دەمێ هەبوونا نیشانێن تێکچوونان د هۆرمۆنێ گەشەیێدا.

## نیشانێن کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ گەشەیێ ل دەڤ زارۆکان:

1. لاوازبوونا ڕێژەیا گەشەیێ ب بەراوردکرن دگەل زارۆکێن هەمان تەمەن یێن تەندرۆست.

2. بلنداهی، مل و دەستێن وان کورتترن و کێشا لەشێ وان کێمترە ب بەراوردکرن دگەل زارۆکێن هەمان تەمەن یێن تەندرۆست.
3. قەبارێ ئەندامێ نێرینە بچویکترە ب بەراوردکرن دگەل قەبارێ ئاسایی.
4. گیرۆبوونا تەمەنێ پێگەهشتنێ (تأخر البلوغ).

نیشانێن ل دەڤ مەزنان دەردکەڤن ل دەمێ کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ GH:

1. ماندیبوون.
2. کێمبوونا چرییا هەستییان.
3. کێمبوونا بارستەیا ماسۆلکەیان.

**تێبینی:**

- پتریا جاران هندەک تێکچوونێن دیتر یێن گرێدایی لەشی ڕوویددەن نیشانێن ل سەری دیارکری ل سەر نەخۆشی دەردکەڤن ژبەر هندێ پتریا جاران پشت ب ئەڤێ پشکنینێ بتنێ ناهێتە بەستن ژ بۆی مەزن و پێگەهشتییان.

نیشانێن بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ گەشەیێ (Gigantism) ل دەڤ زارۆکان:

1. گەشەیا وان زۆر بلەزترە و گەشەترن ب بەراوردکرن دگەل زارۆکێن هەمان تەمەن هەی.
2. قەبارێ سەرێ وان مەزنترە ب بەراوردکرن دگەل قەبارەیێ سەرێ زارۆکەکێ ئاسایی.
3. دەست و پێ مەزنترن ب بەراوردکرن دگەل قەبارەیێ دەست و پێیێن زارۆکەکێ ئاسایی.
4. تا ڕادەیەکی قەلەوییەکا سڤک تا مامناڤەند یا هەی.



نیشانێن بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ گەشەیێ (Acromegaly) ل دەڤ مەزن و پێگەهشتییان:



1. بۆڕبوونا دەنگی.
2. زێدە خۆهدان و بێهنا لەشی.
3. هەبوونا سەروچاڤێن(Face) دێم مەزن وەکی مەزنبوونا لێڤ، دفن، ئەزمانی.
4. ستیربوونا هەستییان.
5. چەوربوونا پیستێ لەشی.
6. تێکچوونا زڤرۆکا هەیڤانە ل دەڤ ئافرەتان.
7. هەبوونا نەڕێکییێ د ئەندامێ زاوزێدا ل دەڤ ڕەگەزێ نێر.

هندەک ژ خوارنێن ب مفا ژ بۆ زێدەکرنا ڕێژەیا هۆرمۆنێ گەشەیێ:



- تەماتە.
- هێک.
- ماسی.
- گیز.
- تری.

رامانا ئەنجامێن پشکنینا هۆرمۆنێ گەشەیێ GH:

- ل دەمێ زارۆک تووشی کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ GH دبیت، دبیت مفادار بیت ب ڕێکا تەمامکەرێن GH، تەمامکەرێن GH ب شێوەیێ دەرزیێیە هۆرمۆنێ گەشەیا مروڤی یێ دروستکری د ناڤدایە ب زارۆکی دهێتەدان، ل دەمێ زوی دهێتە دەستنیشانکرن زارۆک تووشی کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ GH بوویە د سالا ئێکێدا دبیتن چەند ئینجەکان زارۆک گەشەبکەت، هندەک زارۆک ژیک کێمتر و هێدی هێدی گەشەدکەن و مفای ژێ دبینن.

- ل دەمێ نەهاتنا خار یا ڕێژەیا هۆرمۆنێ GH د پرۆسێسا پشکنینکرنا ڕێژەیا هۆرمۆنێ GH دا دبیت زارۆک تووشبووی بیت ب ئێک ژ بارودۆخێن Gigantism یان Acromegaly

تێبینی:

- هەردووک بارودۆخێن (Gigantism - Acromegaly) د لاپەڕێ چوونیدا هاتینە بەحسکرن و شرۆڤەکرن.

- هەردووک بارودۆخێن Gigantism - Acromegaly پتریا جاران ڕوویددەن ژ ئەگەرێ هەبوونا گرێیەکێ د ڕژێنا ژێر مێشکیدا، ڕژێنا ژێر مێشکی چییە؟ ڕژێنەکا بچویکە دکەڤیتە ل ژێر مێشکیدا و کۆنترۆلا پتریا کاران دکەت وەکی گەشەکرنێ، پتریا جاران چارەسەرییا ڤان بارودۆخان ب ڕێکا تیشک، نشتەگەری یان دەرمانان ب خۆڤەدگریت، پتریا جاران ئەگەر ژ ئەگەرێ گرێیان نەبیت نۆژدارێ تایبەتمەند دێ داخوازا هندەک پشکنینێن دیتر کەت ژ بۆ زارۆک و پێگەهشتی و مەزنان.

ژوان پشکنینێن هاریکار ژ بۆ دەستنیشانکرنا رێژەیا هۆرمۆنێ گەشەیێ:

پشکنینا IGF-1

IGF-1 چییە ؟ (د لاپەرێن داهاتیدا ب تیر و تەسەل یا هاتییە بەحسکرن و شرۆڤەکرن) هۆرمۆنەکە هاریکارییا ب رێڤەبرنا رێژەیا GH دکەت د ناڤ لەشیدا، ئاستێ IGF-1 ب درێژاهییا رۆژێ ب جێگیری دمینیت، ژبەر هندێ دشێین ب رێکا ڤێ پشکنینێ مفایی وەربگرین ئەرێ لەشێ مرۆڤی رێژەیا ئاسایی ژ هۆرمۆنێ گەشەیێ دروست دکەت یان نە.

پشکنینا IGBP-3

IGBP-3 چییە ؟ پرۆتینەکە هەلگرێ سەرەکییێ IGF-1 یە، دشیاندایە مفادار بین ژ ئەڤێ پشکنینێ ژ بۆ زانین و دەستنیشانکرنا کێمبوون یان بلندبوونا رێژەیا هۆرمۆنێ GH

پشکنینا هۆرمۆنێ گەشەیێ ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- GH Test
- Human Growth Hormone Test
- Somatropin Test
- Growth Hormone Stimulation Test
- Growth Hormone Suppression Test

PITUITARY GLAND



## پشکنینا هۆرمۆنێ IGF-1

مفا ژ پشکنینا IGF-1 دهێته وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا رێژەیا هۆرمۆنێ IGF-1 د ناڤ خوینێدا، ب رێکا پشکنینا هۆرمۆنێ IGF-1 دشێین زانیارییان وەربگرین ل سەر هۆرمۆنێ گەشەیێ ژ بۆ هندێ بهێته زانین و ئاشکەراکرن ئەرێ لەش رێژەیا پێدڤی ژ هۆرمۆنێ گەشەیێ دروست دکەت یان ژێک نە ژبەر کو رێژەیا هۆرمۆنێ گەشەیێ ب درێژاهییا رۆژێ ل دویڤ رێژەیا خۆراک و چالاکییان دهێته گوهورین، IGF-1 کاریگەرییێن هۆرمۆنێ گەشەیێ Growth Hormne د ناڤ لەشیدا ب رێڤەدبەت، هەردووک هۆرمۆنێن IGF-1 و GH پێکڤە گەشەیا هەستی و شانەیان تەمام دکەن.

### رێژەیا ئاسایی یا پشکنینا هۆرمۆنێ IGF-1:

- 60.0 - 350.0 ng/ml



**بۆچی پشکنینا هۆرمۆنێ IGF-1 دهێتە ئەنجامدان؟**

**ب شێوەیەکێ گشتی پشکنینا هۆرمۆنێ IGF-1 دهێتە ئەنجامدان ل دەمێ هەبوونا ئاریشەیێن گرێدایی هۆرمۆنێ گەشەیێ Growth Hormone**

**هندەک ژ تێکچوونێن گرێدایی هۆرمۆنێ گەشەیێ:**

**- ل دەمێ کێمبوونا هۆرمۆنێ گەشەیێ GH: ب تایبەتی ل دەڤ زارۆکان هۆرمۆنێ گەشەیێ زۆر یێ گرنگە ژ بۆ گەشەکرنا ئاسایی دگەل مەزنبوونا تەمەنی.**

**کێمبوونا هۆرمۆنێ گەشەیێ GH ل دەڤ زارۆکان د شیاندایە ببیتە ئەگەرێ:**

- **گەشەکرنا زارۆکی ب شێوەیەکێ هێدی(نەئاسایی) و بەژنەکا کورتتر هەبیت ب بەراوردکرن دگەل زارۆکێن ئاسایی و تەندرۆست یێن هەمان تەمەن هەی.**

**کێمبوونا هۆرمۆنێ گەشەیێ GH ل دەڤ مەزن و پێگەهشتییان د شیاندایە ببیتە ئەگەرێ:**

- **کێمبوونا چڕییا هەستییان و کێمبوونا بارستەیا ماسۆلکەیان و...هتد.**
- **ل دەمێ هەبوون و تووشبوون ب نەخوشییا لارۆن.**

**نەخوشییا لارۆن چییە؟ نەخوشییەکا بۆماوەیی یا دەگمەنە دبیتە ئەگەر ئەو هۆرمۆنێ گەشەیێ یێ ژ لایێ لەشیڤە هاتییە بەرهەمهینان دشیاندانینە بهێتە ب کارهینان.**

- ل دەمێ هەبوونا بارودۆخێ Gigantism: بارودۆخەکێ دەگمەنە د ژییێ زارۆکینییێدا پەیدادبیت د بیتە ئەگەرێ زێدە بەرهەمهینانا هۆرمۆنێ گەشەیێ GH د ناڤ لەشیدا، ئەو کەسن یێن زۆر مەزن ژ لایەنێ لەشیڤە د ژییەکێ زویدا ب بەراوردکرن دگەل کەسێن هەمان تەمەن هەی دەست و پێیێن وان دمەزنن.

- ل دەمێ هەبوونا بارودۆخێ Acromegaly: نەخوشییەکە تووشی مەزنان دبیت، دبیتە ئەگەر لەش ڕێژەیەکا زۆر ژ هۆرمۆنێ گەشەیێ بەرهەم بینیت، کەسێن پێگەهشتی و نەخوشیا Acromegaly ل دەڤ هەی هەستییێن وان مەزنترن ژ ڕێژەیا ئاسایی، و هەروەسا دەست و پێ و سەروچاڤێن وان مەزنترن.

### کەنگی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ IGF-1 بهێتە ئەنجامدان؟

دێ پێدڤی ب پشکنینا هۆرمۆنێ IGF-1 بی ل دەمێ هەبوونا نیشانێن تێکچوون و ئاریشەیێن گرێدایی ڕێژەیا ئاسایی یا هۆرمۆنێ گەشەیێ.

### نیشانێن کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ گەشەیێ GH ل دەڤ زارۆکان:

1. لاوازبوونا ڕێژەیا گەشەیێ ب بەراوردکرن دگەل زارۆکێن هەمان تەمەن هەی یێن تەندرۆست.
2. بلنداهی، مل و دەستێن وان کورتترن و کێشا لەشێ وان کێمترە ب بەراوردکرن دگەل زارۆکێن هەمان تەمەن هەی یێن تەندرۆست.
3. قەبارێ ئەندامێ نێرینە بچویکترە ب بەراوردکرن دگەل قەبارێ ئاسایی.
4. تەنکبوونا موییێن پرچێ.
5. لاوازبوونا گەشەیا نینوکان.

نیشانێن بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ گەشەیێ (Gigantism) ل دەڤ زارۆکان:



1. گەشەیا وان زۆر بلەزترە و گەشەترن ب بەراوردکرن دگەل زارۆکێن هەمان تەمەن هەی.
2. قەبارێ سەرێ وان مەزنترە ب بەراوردکرن دگەل قەبارەیێ سەرێ زارۆکەکێ ئاسایی.
3. دەست و پێ مەزنترن ب بەراوردکرن دگەل قەبارەیێ دەست و پێیێن زارۆکەکێ ئاسایی.
4. هەتا ڕاددەیەکی قەلەوییەکا سڤک تا مامناڤەند یا هەی.

نیشانێن بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ گەشەیێ (Acromegaly) ل دەڤ مەزن و پێگەهشتییان:



1. تێکچوونا زڤرۆکا هەیڤانە ل دەڤ ئافرەتان.
2. هەبوونا سەرۆچاڤێن(Face) دێم مەزن وەکی مەزنبوونا لێڤ، دفن، و ئەزمانی.
3. هەبوونا نەڕێکییێ د ئەندامێ زاوزێدا ل دەڤ ڕەگەزێ نێر.
4. ستیربوونا هەستییان.
5. چەوربوونا پیستێ لەشی.
6. گڕبوونا دەنگی.
7. زێدە خۆهدان و بێهنا لەشی.

ڕامانا ئەنجامێن پشکنینا هۆرمۆنێ IGF-1:

- ل دەمێ ئەنجامێ پشکنینا زارۆکەکێ نەخوش کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ IGF-1 نیشانبدەت:

دبیت ب رامانا تووشبوونێیە ب کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ گەشەیێ یان تووشبوون ب نەخوشیا لاڕۆن(نەخوشیا لاڕۆن د لاپەڕێن چوویبدا هاتییە بەحسکرن)، دبیت ئەڤ بارودۆخە ژ ئەگەرێ نەخوشیێن بۆماوەیی یان مێشکیڤە بیت، زارۆک دێ مفادار بیت ب ڕێکا تەمامکەرێن GH، تەمامکەرێن GH ب شێوەیێ دەرزیێیە کو هۆرمۆنێ گەشەیا مروڤی یێ دروستکری د ناڤدایە ب زارۆکی دهێتەدان، ل دەمێ زوی دهێتە دەستنیشانکرن زارۆک تووشی کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ گەشەیێ GH بوویە د سالا ئێکێدا دبیتن چەند ئینجەکان زارۆک گەشەبکەت، هندەک زارۆک ژێک کێمتر و هێدی هێدی گەشەدکەن و مفای ژێ دبینن.

- ل دەمێ ئەنجامێ پشکنینا زارۆکەکێ نەخوش بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ IGF-1 نیشانبدەت:

ئاماژەیە ژ بۆ هەبوون و تووشبوون ب ئێک ژ بارودۆخێن Gigantism یان Acromegaly ، هەردووک بارودۆخێن Gigantism - Acromegaly پتریا جاران ڕوویددەن ژ ئەگەرێ هەبوونا گرێیەکێ د ڕژێنا ژێر مێشکیدا، ڕژێنا ژێر مێشکی چییە؟ ڕژێنەکا بچویکە دکەڤیتە ل ژێر مێشکیدا و کونترۆلا زۆرەک ژ کاران دکەت وەکی گەشەکرنێ. پتریا جاران چارەسەریا ڤان بارودۆخان ب ڕێکا تیشک، نشتەگەری یان دەرمانان ب خۆڤەدگریت، پتریا جاران ئەگەر ژ ئەگەرێ گرێیان نەبیت نۆژدارێ تایبەتمەند دێ داخوازا هندەک پشکنینێن دیتر کەت ژ بۆ زارۆک و پێگەهشتی و مەزنان.

پشکنینا هۆرمۆنێ IGF-1 ب ڤان شێوازان دهێتە ڤیسین:

- IGF-1 Test
- Insulin-like Growth Factor 1 Test
- Somatomedin C Test



## پشکنینا هۆرمۆنێ DHEAS

مفا ژ پشکنینا DHEAS دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا رێژەیا هۆرمۆنێ DHEAS د ناڤ خوینێدا، هۆرمۆنێ DHEAS کورتکرییا Dehydroepiandrosterone Sulfate ـــە. هۆرمۆنێ DHEAS ب هۆرمۆنێ زەلامان دهێتە هژمارتن بەلێ د هەردوو رەگەزاندا هەیە، پتریا هۆرمۆنێ DHEAS ژ لایێ رژێنێن ئەدرینالڤە دهێتە دروستکرن (ئەدرینال گلاند دوو رژێنێن بچویکن دکەڤنە د سەر هەردووک گولچیسکاندا)، هەروەسا برەکا کێمتر ژ هۆرمۆنێ DHEAS د هەردووک گوناندا ل دەڤ رەگەزێ نێر و هەروەسا د هێلکەدانێدا ل دەڤ رەگەزێ مێ دهێتە دروستکرن، هۆرمۆنێ DHEAS رۆلەکێ گرنگ دگێریت د دروستکرنا هۆرمۆنێ نێرینەیێ سێکسی تیستیسترون هەروەسا دروستکرنا هۆرمۆنێ مێینەیێ سێکسی ئستروجین، هەروەسا هۆرمۆنێ DHEAS پشکدارە د گەشەکرنا تایبەتمەندییێن سێکسی ل دەڤ رەگەزێ نێر د ماوەیێ پێگەهشتنێدا، هندەک ژ کارێن دیتر یێن هۆرمۆنێ DHEAS د ناڤ لەشیدا ئەنجامددەت ژوان هاریکارییا کونترولکرنا لێدانێن دلی، پەستانا خوینێ و ....هتد دکەت، ل دەمێ نەئاساییبوونا رێژەیا ئەنجامێ پشکنینا هۆرمۆنێ DHEAS پتریا جاران ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا ئاریشەیان د رژێنێن ئەدرینالدا یان ژێک ئەندامێ زاوزێ و هیلکەدانێ، زۆربەیا جاران دبیتن پشکنینا هۆرمۆنێ DHEAS دگەل هۆرمۆنێ Testestrone ل دەڤ رەگەزێ نێر و هەروەسا هۆرمۆنێ Estrogen ل دەڤ رەگەزێ مێ پێکڤە بهێنە ئەنجامدان.



**ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا هۆرمۆنێ DHEAS:**

**ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا هۆرمۆنێ DHEAS دهێنە گوهۆڕین ل دویڤ ڕەگەز و تەمەنێ مرۆڤی.**

**ل دەڤ ڕەگەزێ نێر:**

| تەمەن | ڕێژەیێن ئاسایی | یەکە |
|---|---|---|
| ١٠ هەتا ١٤ سالییێ | 24.7 - 247 | ug/dL |
| ١٥ هەتا ١٩ سالییێ | 70.2 - 492 | ug/dL |
| ٢٠ هەتا ٢٤ سالییێ | 211- 492 | ug/dL |
| ٢٥ هەتا ٣٤ سالییێ | 160 - 449 | ug/dL |
| ٣٥ هەتا ٤٤ سالییێ | 88.9 - 427 | ug/dL |
| ٤٥ هەتا ٥٤ سالییێ | 44.3 - 331 | ug/dL |
| ٥٥ هەتا ٦٤ سالییێ | 51.7 - 295 | ug/dL |
| ٦٥ هەتا ٧٤ سالییێ | 33.6 - 249 | ug/dL |
| ٧٥ سالییێ | 16.2 - 123 | ug/dL |

**ل دەڤ ڕەگەزێ مێ:**

| تەمەن | ڕێژەیێن ئاسایی | یەکە |
|---|---|---|
| ١٠ هەتا ١٤ سالییێ | 33.9 - 280 | ug/dL |
| ١٥ هەتا ١٩ سالییێ | 65.1 - 368 | ug/dL |
| ٢٠ هەتا ٢٤ سالییێ | 148 - 407 | ug/dL |
| ٢٥ هەتا ٣٤ سالییێ | 98.8 - 340 | ug/dL |
| ٣٥ هەتا ٤٤ سالییێ | 60.9 - 337 | ug/dL |
| ٤٥ هەتا ٥٤ سالییێ | 35.4 - 256 | ug/dL |
| ٥٥ هەتا ٦٤ سالییێ | 18.9 - 205 | ug/dL |
| ٦٥ هەتا ٧٤ سالییێ | 9.40 - 246 | ug/dL |
| ٧٥ سالییێ | 12.0 - 154 | ug/dL |

## بۆچی پشکنینا هۆرمۆنێ DHEAS دهێتە ئەنجامدان؟

1. ژ بۆ ئاگەهداربوون ژ تەندرۆستییا ڕژێنێن ئەدرینال.
2. دەستنیشانکرنا گرێیێن ڕژێنێن ئەدرینال.
3. دەستنیشانکرنا تێکچوونێن گرێدایی ئەندامێ زاوزێ و هێلکەدانێ.
4. ژ بۆ زانینا ئەگەرێن زوی گەهشتنا کوڕان ب تەمەنێ پێگەهشتنێ.
5. ژ بۆ زانینا ئەگەرێن زێدە هاتنا موییان ل دەڤ ژن و کچان.



## کەنگی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ DHEAS بهێتە ئەنجامدان؟

دێ پێدڤی ب پشکنینا هۆرمۆنێ DHEAS بی ل دەمێ هەبوونا نیشانێن بلندبوون یان کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنی، پتریا جاران ل دەڤ رەگەزێ نێر هیچ نیشانەیەکا بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ DHEAS دەرناکەڤن، بەلێ نیشانێن بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ DHEAS ل دەڤ ژن و کچان دەردکەڤن، وەکی....

1. گڕبوونا دەنگی.
2. زێدەبوونا موییان ل سەر لەشی و ب تایبەتی سەروچاڤان.
3. وەریانا پرچی ل ناڤەڕاستا سەری.
4. تێکچوونا زڤڕۆکا هەیڤانە.
5. پرسک.
6. زێدەبوونا قەبارەیێ ماسۆلکەیان.

**نیشانێن کێمبوونا هۆرمۆنێ DHEAS دبیت ژ ئەگەرێ تێکچوونێن گرێدایی ڕژێنێن ئەدرینالڤە بن....**

1. هەلاڤێتن.
2. هەستکرن ب هەلاڤێتنێ.
3. گێژبوون.
4. کێمبوونا کێشا لەشی بێی هەبوونا ئەگەرەک دەستنیشانکری.
5. هشکبوون.

**هندەک ژ نیشانێن دیتر یێن گرێدایی هۆرمۆنێ DHEAS کو پەیوەندی ب پیربوونێڤە هەنە ژوان:**

1. کێمبوونا حەزا سێکسی.
2. هەبوونا ئاریشەیان د ئەندامێ زاوزێ یێ زەلاماندا.
3. تەنکبوونا شانەیێن زێ ل دەڤ ئافرەتان.

**تێبینی:**

- هندەک جاران زارۆکان پشکنین بۆ دهێتە ئەنجامدان ل دەمێ ئەندامێ زاوزێ یێ وان ب ئاشکەرایی نەهێتە دیتن، یان ژیک ل دەڤ ڕەگەزێ نێر ل دەمێ زوی د گەهنە تەمەنێ پێگەهشتنێ.



**ڕامانا ئەنجامێن پشکنینا هۆرمۆنێ DHEAS:**

**- ئەگەر ئەنجامێ پشکنینا هۆرمۆنێ DHEAS کێمتر بوو ژ ڕێژەیا ئاسایی دبیت نەخوش تووشبووی بیت ب....**

- **نەخوشییا ئەدیسون، ل دەمێ تووشبوون ب نەخوشییا ئەدیسون ڕژێنا ئەدرینال د شیاندا نینە بەشێ پێدڤی ژ دروستکرنا هندەک ژ هۆرمۆنان دروست بکەت.**
- **بارودۆخێ Hypopituitarism، دڤی بارودۆخیدا د شیانێن ڕژێنا ژێر مێشکیدا نینە بەشێ پێدڤی یێ بەشەک ژ هۆرمۆنان دروستبکەت یێن لەشی پێدڤی.**

**- ئەگەر ئەنجامێ پشکنینا هۆرمۆنێ DHEAS بلندتر بوو ژ ڕێژەیا ئاسایی دبیت نەخوش تووشبووی بیت ب....**

- **تووشبوون ب Congenital Adrenal Hyperplasia، تێکچونەکا بۆماوەییە توشی ڕژێنێن ئەدرینال دبیت.**
- **تووشبوون ب گرێیێن ڕژێنا ئەدرینال دبیت گرێیێن پەنجەشێرێ یان نەپەنجەشێری بن.**
- **تووشبوون ب کیسێن هێلکەدانێ (PCOS)، پتریا جاران PCOS دبیتە ئەگەرێ نەزۆکییێ ل دەڤ ئافرەتان.**

**پشکنینا هۆرمۆنێ DHEAS ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:**

- **DHEAS Tets**
- **DHEA sulfate test**
- **DHEA-S Test**
- **DHEA Test**
- **DHEA**
- **DHEA-SO4 Test**
- **dehydroepiandrosterone sulfate**

## پشکنینا Adrenocorticotropic Hormone Test - ACTH

مفا ژ پشکنینا ACTH دهێته وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڕێژەیا هۆرمۆنێ Adrenocorticotropic د ناڤ خوینێدا، هۆرمۆنێ ACTH ژ لایێ ڕژێنا ژێر مێشکیڤە دهێتە بەرهەمهینان کو ڕژێنەکا بچویکە دکەڤیتە ژێر مێشکیدا، هۆرمۆنێ ACTH کۆنترۆلا هۆرمۆنەکێ دیتر دکەت ب ناڤێ هۆرمۆنێ کورتیزول (پشکنینا هۆرمۆنێ کورتیزول د لاپەڕێن چوویدا هاتییە بەحسکرن ب شێوەیەکێ تێر و تەسەل)، ژ لایێ هەردووک ڕژێنێن ئەدرینالڤە هۆرمۆنێ کورتیزول دهێتە بەرهەمهینان (ئەدرینال گلاند دوو ڕژێنێن بچویکن دکەڤنە د سەر هەردووک گولچیسکاندا). هۆرمۆنێ کورتیزول ڕۆلێن گرنگ د ناڤ لەشیدا دگێریت ژوان (بەرسڤدان ل دەمێ هەبوونا بارودۆخێن سترێس و فشارێ، شەرکرن دژی هەوکرنان، ڕێکخستنا پەستانا خوینێ، ڕێکخستنا شەکرێ د ناڤ خوینێدا، ڕێکخستنا میتابۆلیزمان (چەوانییا ب کارهینانا وزە و خوارنێ ژ لایێ لەشیڤە).

ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا هۆرمۆنێ ACTH:

- 7.2 – 63.6 pg/ml



## بۆچی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ ACTH بهێتە ئەنجامدان؟

پتریا جاران پشکنینا ACTH دگەل پشکنینا هۆرمۆنێ Cortisol پێکڤە دهێنە ئەنجامدان ژ بۆ دەستنیشانکرن و چاڤدێریکرنا ئاریشەیێن گرێدایی ڕژێنا ژێر مێشکی یان ڕژێنا ئەدرینالڤە....

1. ل دەمێ هەبوونا بارودۆخێ Cushing's syndrome دبیتە ئەگەرێ زێدە بەرهەمهینانا هۆرمۆنێ کورتیزول زێدەتر ژ یا لەش پێدڤی، دبیتن ژ ئەگەرێ هەبوونا گرێیەکێ د ڕژێنا ژێر مێشکیدا یان ژ ئەگەرێ ب کارهینانا چارەسەرییێن ستیرۆیدی بیت، ستیرۆید ژ بۆ چارەسەرییێن هەوکرنان دهێنە ب کارهینان بەلێ زۆر جاران دشیاندایە کاریگەرییێن لاوەکی دروست بکەن و ببنە ئەگەر کارتێکرنێ ل سەر ڕێژەیا هۆرمۆنێ کورتیزول بکەت.
2. ل دەمێ هەبوونا نەخوشییا ئەدیسۆن لەش ڕێژەیا پێدڤی ژ هۆرمۆنێ کورتیزول یا لەش پێدڤی دروست ناکەت.
3. ل دەمێ هەبوونا بارودۆخێ Hypopituitarism، تێکچوونەکە تێدا ڕژێنا ژێر مێشکی ڕێژەیا پێدڤی ژ یا لەش پێدڤی یا بەشەک ژ هۆرمۆنان یان هەمی ئەو هۆرمۆنێن بەرهەمدهینیت دروست ناکەت.

## کەنگی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ ACTH بهێتە ئەنجامدان؟

ل دەمێ هەبوونا نیشانێن کێمبوون یان بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ کورتیزول د ناڤ لەشیدا پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ ACTH بهێتە ئەنجامدان.



نیشانێن کێمبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ کورتیزول د ناڤ لەشیدا:



1. کێمبوونا کێشا لەشی.
2. هەلاڤێتن.
3. زکچوون .
4. ئێشانا زکی.
5. کێمبوونا پەستانا خوینێ.
6. گێژبوون.
7. هەستکرن ب لاوازبوونێ.
8. گوهۆڕینا ڕەنگێ پیستێ لەشی ژ بۆ ڕەنگێ ڕەش.

نیشانێن بلندبوونا ڕێژەیا هۆرمۆنێ کورتیزول د ناڤ لەشیدا:

1. زێدەبوونا کێشا لەشی.
2. زێدەبوونا موویێن لەشی.
3. خرڤەبوونا چەورییان د ناڤ لەشیدا.
4. هەستکرن ب وەستیان و لاوازبوونێ.
5. لاوازبوونا ماسولکەیان.
6. پرسک.
7. سترێس.
8. سەر ئێشان.



هەروەسا دبیت پێدڤی ئەنجامدانا پشکنینا هۆرمۆنێ ACTH بی ل دەمێ نیشانێن هەبوونا بارودۆخێ Hypopituitarism، هەروەسا دبیت نیشانێن نەخوشییێ ل دویڤ توندییا بارودۆخێ تەندرۆستی بهێنە گوهورین، هندەک ژ نیشانان.....

1. نەمانا حەزا خوارنێ.
2. تێکچوونا زڤرۆکا هەیڤانە.
3. نەزۆکی ل دەڤ رەگەزێ مێ.
4. کێمبوونا حەزا سێکسی ل دەڤ هەردوو رەگەزا.
5. هەستیاری ب سەرمایێ.
6. زۆربوونا جارێن میزکرنێ.
7. هەستکرن ب ماندیبوونێ.

**رامانا ئەنجامێن پشکنینا هۆرمۆنێ ACTH:**

پتریا جاران ئەنجامێن پشکنینا هۆرمۆنێ ACTH دگەل هۆرمۆنێ کورتیزول دهێنە بەراوردکرن....

1. ل دەمێ بلندبوونا رێژەیا هەردووک هۆرمۆنێن ACTH دگەل هۆرمۆنێ کورتیزول :
دبیت ئاماژە بیت ژ بۆ هەبوون و تووشبوون ب نەخوشییا Cushing's

2. ل دەمێ کێمبوونا رێژەیا هۆرمۆنێ ACTH و بلندبوونا رێژەیا هۆرمۆنێ کورتیزول :
دبیت ئاماژە بیت ژ بۆ هەبوونا بارودۆخێ Cushing's یان ژێک هەبوونا گرێیەکێ د رژێنا ئەدرینالدا.

3. ل دەمێ بلندبوونا رێژەیا هۆرمۆنێ ACTH و کێمبوونا رێژەیا هۆرمۆنێ کورتیزول :
دبیت ئاماژە بیت ژ بۆ هەبوون و تووشبوون ب نەخوشییا ئەدیسون.(نەخوشییا ئەدیسون د لاپەرێن چوویدا هاتییە بەحسکرن).

4. ل دەمێ کێمبوونا رێژەیا هەردووک هۆرمۆنێن ACTH دگەل هۆرمۆنێ کورتیزول :
دبیت ئاماژە بیت ژ بۆ هەبوونا بارودۆخێ Hypopituitarism

## پشکنینا هۆرمۆنێ ACTH ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Adrenocorticotropic hormone blood test
- Corticotropin
- ACTH Test
- ACTH
- Adrenocorticotropic Hormone
- Adrenocorticotropic Hormone Test



## پشکنینا هۆرمۆنێ ئەنسۆلین Insulin Test

مفا ژ پشکنینا Insulin ی دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا رێژەیا هۆرمۆنێ ئەنسۆلین دناڤ خوینێدا. هۆرمۆنێ ئەنسۆلین دهێتە دەردان و پاشەکەڤتکرن دناڤ پەنکریاسێدا د خانەیێن بێتا دا، هۆرمۆنێ ئەنسۆلین دهێتە دەردان وەکی بەرسڤدانەک ل دەمێ بلندبوونا رێژەیا گلووکۆزی ل دەمێ خوارن و ڤەخوارنان و هەروەسا ب گرنگ دهێتە هژمارتن ژ بۆ ڤەگوهاستن و پاشەکەڤتکرنا گلووکۆزی(گلووکۆز ب سەرچاوەیێ سەرەکی یێ وزێ دهێتە هژمارتن). هۆرمۆنێ ئەنسۆلین هاریکارە ژ بۆ ڤەگوهاستنا گلووکۆزی ژ بۆ ناڤا خانەیان، و هاریکارە ژ بۆ بەلانسا رێژەیا گلووکۆزی دناڤا خوینێدا و هەروەسا رۆل یێ هەی د میتابۆلیزما چەوریياندا.

رێژەیا ئاسایی یا پشکنینا هۆرمۆنێ ئەنسۆلین:

- 2.60 - 24.90 uIU/mL



## بۆچی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ ئەنسۆلین بهێتە ئەنجامدان؟

1. ژ بۆ دەستنیشانکرنا گرێیێن ئەنسۆلینێ، یان ل دەمێ ڕاکرنا گرێیێ یان ژ بۆ چاڤدێریکرنا گرێیێ.
2. ژ بۆ دەستنیشانکرنا ئەگەرێن کێمبوونا ڕێژەیا گلووکۆزی دناڤ خوینێدا یان ل دەمێ هەبوونا نیشانێن کێمبوونا ڕێژەیا گلووکۆزی.
3. ژ بۆ پێناسەکرنا بەرگرییا ئەنسۆلینێ.
4. ژ بۆ چاڤدێریکرنا ڕێژەیا ئەنسۆلینێ دهێتە دەردان ژ لایێ پەنکریاسێڤە دناڤ خانەیێن بێتا دا.
5. ل دەمێ هەبوونا نەخۆشییا شەکرێ ژ جورێ دوویێ و وەرگرتنا چارەسەری و دەرمانان ل ژێر چاڤدێری و ڕاوێژا نۆژدارێن تایبەتمەندڤە.

**تێبینی:**

- پتریا جاران نۆژدار پشکنینا هۆرمۆنێ ئەنسۆلین دگەل پشکنینا C-peptide و هندەک جاران دگەل پشکنینا Glucose Tolerance Test (GTT) پێکڤە داخواز دکەت.

- هەردووک پشکنینێن Glucose Tolerance Test (GTT) و C-peptide د لاپەڕێن چوویدا هاتینە بەحسکرن و شرۆڤەکرن ب شێوەیەکێ تێر و تەسەل.



## کەنگی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ ئەنسۆلین بهێتە ئەنجامدان؟

ل دەمێ هەبوونا نیشانێن وەکی....

1. خۆهدان.
2. برسیبوون.
3. لەرزین.
4. هەستکرن ب گێژبوونێ.
5. بێهوشبوون.

## د ڤان بارودۆخاندا ئەگەرێ بلندبوونا رێژەیا هۆرمۆنێ ئەنسۆلین هەیە:

1. بارودۆخێ Acromegaly (د لاپەرێن داهاتییدا هاتییە بەحسکرن و شرۆڤەکرن).
2. بارودۆخێ Cushing
3. قەلەوی.
4. Insulinomas
5. بەرگەنەگرتنا فرەکتوز یان گەڵەکتوزی(هەردووک جورێن شەکرێنە).
6. ب کارهینانا هندەک ژ جورێن دەرمانان وەکی corticosteroids, levodopa, oral contraceptives
7. نەخۆشییا شەکرێ ژ جورێ ۲یێ.

## د ڤان بارودۆخاندا ئەگەرێ کێمبوونا رێژەیا هۆرمۆنێ ئەنسۆلین هەیە:

1. نەخۆشییا شەکرێ.
2. نەخۆشی و ئاریشەیێن گرێدایی پەنکریاسێ.
3. Hypopituitarism



## پشکنینا هۆرمۆنێ ئەنسۆلین ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Insulin Test
- Insu Test
- Insulin
- Insulin level
- Insulin level Test



## پشکنینا کۆرتیزۆڵ Cortisol Test

مفا ژ پشکنینا Cortisol ی دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا رێژەیا هۆرمۆنێ کۆرتیزۆڵ دناڤ خوین و میز، تفێدا، کۆرتیزۆڵ دهێتە دەردان ژ لایێ رژێنا ئەدرینالڤە (ئەدرینال گلاند دوو رژێنێن بچویکن دکەڤنە د سەر گولچیسکاندا)، کۆرتیزۆڵ دهێتە هژمارتن وەکی هۆرمۆن و کارێن گرنگ دناڤ لەشیدا ئەنجامددەت وەکی بەرسڤدان بۆ سترێسێ و هاریکارییا بەلانسا پەستانا خوینێ و رێژەیا شەکرێ و میتابۆلیزما دناڤ لەشیدا دکەت و بەرسڤدان و راوەستیان دژی هەوکرنان و...هتد، ئەگەر ئەنجامێ پشکنینێ بلندتر یان کێمتر بوو ژ رێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا ئاریشەیان د رژێنا ئەدرینالدا، ئەگەر بۆ ماوەیەکی ئەڤ ئاریشەیە نەهێنە چارەسەرکرن ب ئەگەرەکێ زۆر دێ ئەنجامێن خراب ژ بۆ لەشی ل دویڤ خۆ هێلیتن.



## رێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا هۆرمۆنێ کۆرتیزۆڵ:

رێژەیا ئاسایی یا هۆرمۆنێ کۆرتیزۆڵ د هەمی دەماندا وەکی ئێک نینە و ژێکجیاوازە. باشترین دەم ژ بۆ ئەنجامدانا پشکنینێ ل دەمژمێر ٦ بۆ ١٠ی سپێدێیە **یان** ل دەمژمێر ٤ هەتا ٨ ی شەڤێ.

| پشکنین | دەمژمێر | رێژەیا ئاسایی | یەکە |
|---|---|---|---|
| کۆرتیزۆڵ | ٦ هەتا ١٠ /س | 6.02 - 18.4 | ug/dL |
| کۆرتیزۆڵ | ٤ هەتا ٨ /ش | 2.68 - 10.5 | ug/dL |

* س(سپێدە) ش(شەڤ)

## بۆچی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ کۆرتیزۆڵ بهێتە ئەنجامدان:

پشکنینا کۆرتیزۆڵ هاریکارییا دەستنیشانکرنا ئاریشەیێن گرێدایی رژێنێن ئەدرینال دکەت، وەکی بارودۆخێ Cushing's syndrome و نەخۆشییا ئەدیسون Addison Disease و هەروەسا ل دەمێ هەبوونا نیشانێن Adrenal Crisis

- **بارودۆخێ Cushing's syndrome چییە؟** بارودۆخەکە لەش رێژەیەکا زۆر ژ هۆرمۆنێ Cortisol دروست دکەت زێدەتر ژ یا لەش پێدڤی.

- **نەخۆشییا ئەدیسون Addison Disease**(د لاپەرێن چوونیدا هاتییە بەحسکرن) دبیتە ئەگەرێ دروست نە دەردانا هۆرمۆنێ کۆرتیزۆڵ.

- **Adrenal Crisis چییە؟** ب بارودۆخەکێ مەترسیدارێ تەندرۆستی دهێتە هژمارتن و ژیانا نەخۆشی دکەڤیتە د مەترسییێدا ل دەمێ رێژەیا هۆرمۆنێ کۆرتیزۆڵ دگەهیتە رێژەیەکا گەلەک کێم.

## کەنگی پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ کۆرتیزۆڵ بهێتە ئەنجامدان:

پێدڤییە پشکنینا هۆرمۆنێ کۆرتیزۆڵ ئەنجامبدەی ل دەمێ هەبوونا نیشانێن بارودۆخێ Cushing's Syndrome و نەخۆشییا ئەدیسون Addison Disease و هەروەسا Adrenal Crisis

## نیشانێن تووشبوون ب بارودۆخێ Cushing's syndrome:

1. زێدەبوونا کێشا لەشی.
2. بلندبوونا پەستانا خوینێ.
3. بلندبوونا ڕێژەیا شەکرێ.
4. لاوازبوونا ماسۆلکەیان.
5. ل دەڤ ئافرەتان نەئاساییبوونا زڤڕۆکا هەیڤانە.
6. زێدەبوونا موویان ل سەر سەروچاڤان.



## نیشانێن تووشبوون ب نەخۆشیا ئەدیسون Addison Disease:



1. کێمبوونا کێشا لەشی.
2. لاوازبوونا ماسۆلکەیان.
3. ئێشانا گەدەی.
4. هەستکرن ب ماندیبوون و لاوازبوونێ.
5. هەبوونا پنییان ل سەر سەروچاڤان.
6. کێمبوونا پەستانا خوینێ.
7. کێمبوونا موویێن پرچێ.
8. هەلاڤێتن.
9. زکچوون.

## نیشانێن تووشبوون ب بارودۆخێ Adrenal Crisis:

ب بارودۆخەکێ مەترسیدارێ تەندرۆستی دهێتە هژمارتن و ژیانا نەخۆشی دکەڤیتە د مەترسیێدا ل دەمێ رێژەیا هۆرمۆنێ کۆرتیزۆڵ دگەهیتە رێژەیەکا گەلەک کێم.

1. کێمبوونا پەستانا خوینێ ب رێژەیەکا بەرچاڤ.
2. هەلاڤێتنەکا بهێز.
3. زکچوونەکا بهێز.
4. هشکبوون.
5. ئێشانەکا بهێز و یا ژ نشکەکێڤە ل زک و مل و بەشێ خوارێ یێ پشتێ.
6. گێژبوون.
7. هەستکرن ب لاوازبوون و ماندیبوونێ.



**ڕامانا ئەنجامێن پشکنینا هۆرمۆنێ کۆرتیزۆڵ:**

**- ئەگەر ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ بلندتر بیت ژ ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ تووشبوون ب بارودۆخێ Cushing's Syndrome.**

**- ئەگەر ڕێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ کێمتر بیت ژ ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ تووشبوون ب نەخۆشییا ئەدیسون Addison Disease.**

**- ئەگەر ئەنجامێ پشکنینا هۆرمۆنێ کۆرتیزۆڵ نەئاسایی بیت مەرج نینە ئاماژە بیت ژ بۆ تووشبوون ب ئاریشەیەکا تەندرۆستی و پێدڤی ب چارەسەرییێ بیتن، بەلکی هندەک فاکتەرێن دیتر ژیک هەنە دشێن کارتێکرنێ ل ئەنجامێ پشکنینێ بکەن ژوان سترێس و دووگیانبوون و هەوکرن و هندەک دەرمان و...هتد، دشێن کارتێکرنێ ل ڕێژەیا ئاسایی یا ئەنجامێ پشکنینێ بکەن.**

**پشکنینا هۆرمۆنێ کۆرتیزۆڵ ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:**

- Cortisol Test
- Urinary cortisol
- Salivary cortisol
- Free cortisol
- Dexamethasone Suppression Test
- DST
- Cortisol
- Cortisol Level
- Blood cortisol
- Plasma Cortisol
- Cortisol

Dep. Virology Tests

## پشکنینا ڤایرۆسێن جگەرێ Hepatitis (A,B,C,D,E) Virus Test

ڤایرۆسێن جگەرێ دبنە ئەگەرێ هەوکرنا جگەرێ، هەوکرن جگەرێ تووشی وەرمتنێ دکەت ل دەمێ بریندار دبیت یان ل دەمێ تووشی هەوکرنێ دبیت، ڤایرۆسێن جگەرێ دشێن ببنە ئەگەرێ ژ کارکەڤتن و لاوازکرنا شیان و کارێ جگەرێ، هەوکرنا جگەرێ ژ ئەگەرێ ڤایرۆسێن جگەرێ دشێن وەک دەمەکێ کورت Acute یان دۆمدرێژ Chronic د ناڤ لەشیدا بمینن، هندەك ژ جۆرێن ڤایرۆسێ جگەرێ دەمکورتن و هندەك ژ وان دۆمدرێژن.

جگەر ژ گرنگترین ئەندامێن لەشی دهێتە هژمارتن دکەڤیتە لایێ ڕاستێ د بن قەفەسا سینگیدا، ڕۆژانە ب دەهان کاران ڕادبیت د لەشیدا ژ وان پاکژکرنا خوینێ ژ مادەیێن زیانبەخش و بەرمایکێن دەرمانان و دروستکرنا ژمارەکا زۆر ژ پرۆتین و ئەنزیمان و هاریکارییا ڕێکئێخستنا ڕێژەیا شەکرێ و هۆرمۆنان دکەت د ناڤ لەشیدا و پاشکەڤتکرنا ڤیتامین و کانزایان و وزەیێ ژ بۆ دەمێن لەش پێدڤی دبیت و ...هتد.



## ڤایرۆسێن جگەرێ ژ پێنج جۆرێن سەرەکی پێکدهێن:

### ڤایرۆسێ جگەرێ ژ جۆرێ A:

ڤایرۆسێ جگەرێ ژ جۆرێ A دهێتە نیاسین ب (Hepatitis A Virus (HAV، ئەڤ جۆرە پترییا جاران دهێتە ڤەگوهاستن ب ڕێکا پاشماوەیێن پیسبوویی و خوارن و ڤەخوارنێن پیسبوویی ژ کەسێ تووشبوویی ب ڤایرۆسێ جگەرێ ژ جۆرێ A، پترییا جاران نە گەلەک ب مەترسییە و ب ڕێکا چارەسەرییێ هەتا ڕادەیەکێ د شیاندایە بهێتە کونترۆلکرن.

### ڤایرۆسێ جگەرێ ژ جۆرێ B:

ڤایرۆسێ جگەرێ ژ جۆرێ B دهێتە نیاسین ب (Hepatitis B Virus (HBV، ڤایرۆسێ HBV ب جۆرێ مەترسیدارێ هەوکرنا ڤایرۆسێن جگەرێ دهێتە نیاسین، د شیاندایە بۆ ماوەیەکێ کورت و هەتا ماوەیەکێ دۆمدرێژ د ناڤ لەشیدا بمینیت و ببیتە ئەگەرێ ژ کارکەڤتن و لاوازبوونا شیان و کارێ جگەرێ و هەتا دگەهیتە پەنجەشێرا جگەرێ، ڤایرۆسێ جگەرێ ژ جۆرێ B ب ڕێکا دەستی و ماچکرن و بێهنژین و بکارهینانا پێدڤییێن ڕۆژانە وەکی ئامان و جلکان و ...هتد. ناهێتە ڤەگوهاستن.

### ڕێکێن ڤەگوهاستنا ڤایرۆسێ جگەرێ ژ جۆرێ B:

- ب شێوەیەکێ گشتی ب ڕێکا بەرکەڤتن ل گەل خوین و شلەیێن کەسێ تووشبوویی ب ڤایرۆسی دهێتە ڤەگوهاستن.
- بکارهینانا دەرزییێ بەری هینگێ ژ بۆ کەسێ تووشبوویی ب ڤایرۆسی هاتبیتە بکارهینان.
- پەیوەندییێن سێکسی ل گەل کەسێ تووشبوویی ب ڤایرۆسی.
- ڤەگوهاستنا خوینا کەسێ تووشبوویی ب ڤایرۆسی ژ بۆ کەسێ ساخلەم ل دەمێ برینداربوون یان ژ بەر هەر ئەگەرەکێ بیت ببیتە ئەگەرێ وەرگرتنا خوینێ.
- کرنا نشتەگەری و ب تایبەت چوون ژ بۆ دەڤ نۆژدارێن ددانان بێی پاکژکرنا ئامیرێن پزیشکی و بکارهینان ژ بۆ کەسێ ساخلەم ئەگەر بەری هینگێ ژ بۆ کەسێ تووشبوویی ب ڤایرۆسی هاتبیتە بکارهینان.
- ب ڕێکا ئافرەتا دووگیان ژ بۆ زارۆکی ل دەمێ ژدایکبوون و تێکەلبوونا خوینێ.

- ب ڕێکا ئامیرێ تاتۆکرنێ ل دەمێ ئامیرێ چێکرنا تاتۆیان ژ بۆ کەسێ تووشبوویی ب ڤایرۆسی بهێتە بکارهینان و پاشان بێی پاکژکرنا ئامیرێ ژ بۆ تاتۆکرنێ هاتییە بکارهینان ژ بۆ کەسێن ساخلەم بهێتە بکارهینان.

### ڤایرۆسێ جگەرێ ژ جۆرێ C:

ڤایرۆسێ جگەرێ ژ جۆرێ C دهێتە نیاسین ب (Hepatitis C Virus (HCV)، ڤایرۆسێ HCV دهێتە ڤەگوهاستن ب شێوەیەکێ ڕاستەوخۆ ب ڕێکا بەرکەڤتن ل گەل شلەیێن لەشی یێن کەسێ تووشبوویی ب ڤایرۆسی وەکی بکارهینانا دەرزیێ ژ بۆ کەسێ ساخلەم بەری هینگێ هاتبیتە بکارهینان ژ بۆ کەسێ تووشبوویی ب ڤایرۆسی یان کرنا کریارا سێکسی ل گەل کەسێ تووشبوویی ب ڤایرۆسی.

### ڤایرۆسێ جگەرێ ژ جۆرێ D:

ڤایرۆسێ جگەرێ ژ جۆرێ D دهێتە نیاسین ب (Hepatitis D Virus (HDV)، ڤایرۆسێ HDV دهێتە ڤەگوهاستن ب شێوەیەکێ ڕاستەوخۆ ب ڕێکا بەرکەڤتن ل گەل خوینا کەسێ تووشبوویی ب ڤایرۆسی، ڤایرۆسێ HDV گەشە ناکەت بێی هەبوونا ڤایرۆسێ جگەرێ ژ جۆرێ B (HBV) د ناڤ لەشیدا.

### ڤایرۆسێ جگەرێ ژ جۆرێ E:

ڤایرۆسێ جگەرێ ژ جۆرێ E دهێتە نیاسین ب (Hepatitis E Virus (HEV)، هەوکرنا جگەرێ ژ جۆرێ E دهێتە دیتن ل جهێن ڕەوشەنبیریا تەندرۆستی و سەرەدەری و ڕێکارێن تەندرۆستی یێن نەباش هەین.

### چەوانییا خۆپاراستن ژ ڤایرۆسێن جگەرێ:

- ✓ باشترین ڕێك ژ بۆ خۆپاراستن ژ ڤایرۆسان ب ڕێکا ڤاکسینییە، بەلێ هەتا نوکە ژ بۆ ژمارەیەکا زۆر ژ ڤایرۆسان ڤاکسین نەهاتییە دروستکرن.
- ✓ بکارهینانا دەستکێش و دەمامکان ل دەمێ سەرەدەریکرنێ ل گەل کەسێن تووشبوویی ب ڤایرۆسان.
- ☒ بکارنەهینانا پێدڤییێن کەسێ تووشبوویی ب ڤایرۆسی.

**مەترسییێن ڤایرۆسێن جگەرێ:**

ئەگەر کەسێ تووشبوویی ب ڤایرۆسێن جگەرێ ب شێوەیەکێ بلەز نەهێتە چارەسەرکرن دبیت ببیتە ئەگەرێ نەخۆشــییێن دۆمدرێژ یێن گرێدایی جگەرێ و ژکارکەڤتن و لاوازبوونا جگەرێ و دبیت هەتا ببیتە ئەگەرێ پەنجەشێرا جگەرێ.

**هۆکارێن دبنە ئەگەرێ تووشبوون ب هەوکرنا جگەرێ Hepatitis:**

1. ڤـایرۆســێن هەوکرنـا جگەرێ ژ بەربەلاڤترین هۆکـارانە، دبیـت ژ ئەگەرێ جۆرەکێ ڤایرۆسی یان ژ جۆرەکێ پتر بیت، ژ جۆرێن ڤایرۆسێن هەوکرنا جگەرێ A, B, C, D, E
2. ژ ئەگەرێ ڤەخوارنا ڕێژەیەکا زۆر ژ کحۆلێ Alcoholic Hepatitis
3. ژەهراویبوونا جگەرێ ژ ئەگەرێ بکارهینانا مادەیێن کیمیایی.
4. هەوکرنـا جگەرێ ژ ئەگەرێ بەرگرییا لەشـــی دژی خۆ ئەڤ جۆرە ژ جۆرێن دۆمدرێژ دهێتە هژمارتن، تێدا سیستەمێ بەگرییا لەشـی هێرشـی جگەرێ دکەت پتریا جاران ئەگەرێ ســەرەکی نـاهێتە زانین، بەلێ دبیـت ئـاریشــەیێن بۆمـاوەیی یان ژینگەها دەوروبەر ڕۆل تێدا هەبیت.
5. بکارهینانا هندەك ژ جۆرێن دەرمانان.




**نیشانێن هەبوون و تووشبوون ب هەوکرنا جگەرێ Hepatitis:**

1. تا.
2. هەستکرن ب ماندیبوونێ.
3. کێمبوونا حەزا خوارنێ.
4. هەلاڤێتن.
5. زکئێشان.

6. تۆخبوونا ڕەنگێ میزێ.
7. ئێشانا گەهان.
8. هەبوونا نەخۆشییا زەرکێ، زەربوونا ڕەنگێ پیستی و چاڤان.

چاوانییا دەستنیشانکرنا هەوکرنا جگەرێ Hepatitis:

1. نۆژدارێ تایبەتمەند دێ داخوازا مێژوویا خێزانێ ل گەل نەخۆشـییێن گرێدایی جگەرێ کەت.
2. هەبوونا نیشانێن هەوکرنا جگەرێ (د لاپەڕێ چوویدا هاتییە بەحسکرن).
3. پشکنینێن فیزیکی.
4. پشکنینێن خوینێ وەکی پشکنینێن ڤایرۆسێ جگەرێ Hepatitis Virus Test
5. پشکنینێن شیان و کارێ جگەرێ L.F.T
6. گرتنا سۆنەر و تیشکێ Ultrasound, CT scan, or MRI
7. Liver Biopsy



پشکنینا ڤایرۆسێن جگەرێ ب ڤان شێوازان دهێنە نڤیسین:



- Hepatitis Virus Test
- HBV Test
- HCV Test
- Liver Virus Test
- Hepatitis (A,B,C,D,E) Virus Test

ڕەیان صەدیق

## پشکنینا ڤایرۆسێ HIV - Human Immunodeficiency Virus Test

ڤایرۆسێ HIV هێرشی خانەیێن سیستەمێ بەرگرییا لەشی دکەت و دبیتە ئەگەرێ کێمبوونا بەرگرییا لەشی، خانەیێن سیستەمێ بەگرییا لەشی لەشی دپارێزن ژ تەنێن زیانبەخش وەکی: (بەکتریا، ڤایرۆس، کەروو، ...هتد). ئەگەر خانەیێن سیستەمێ بەرگرییا لەشی کێم بن و ژناڤبچن دێ بیتە ئەگەرێ کێمبوونا بەرگرییا لەشی دژی تەنێن زیانبەخش ژ بۆ لەشی و هەتا دبیتە ئەگەرێ مرنێ.




سێ جۆرێن پشکنینێن ڤایرۆسێ HIV دهێنە ئەنجامدان:

1. Antibody Test: ئەڤ پشکنینە دهێتە ئەنجامدان ژ بۆ چاڤدێریکرنا دژەتەنێن ڤایرۆسێ HIV د ناڤ خوینێ و تفێدا، سیستەمێ بەرگرییا لەشی دەست ب دروستکرنا دژەتەنان دکەت ل دەمێ هەبوونا تەنێن زیانبەخش د ناڤ لەشیدا، HIV Antibody Test د شیاندایە بهێنە دەستنیشانکرن پشتی 3 هەتا 14 هەفتییان ژ تووشبوونێ ب ڤایرۆسی.

2. **HIV Antibody/Antigen Test**: ئەڤ پشکنینە دهێتە ئەنجامدان ژ بۆ چاڤدێریکرنا دژەتەنان و Antigens د ناڤ خوینێدا، Antigens دهێنە هژمارتن ژ ڤایرۆسی، ڕێژەیا Antigens د ناڤ خوینێدا بلند دبیت ژ بەری دژەتەنێن ڤایرۆسێ HIV بهێنە دروستکرن، پتریبا جاران د شیاندایە بهێنە دیتن د 2 هەتا 6 هەفتییاندا ژ تووشبوونێ، ژ بەربەلاڤترین پشکنینێن ڤایرۆسێ HIV دهێتە هژمارتن.

3. **HIV Viral Load**: ئەڤ پشکنینە دهێتە ئەنجامدان ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڕێژەیا ڤایرۆسێ HIV د ناڤ خوینێدا، د شیاندایە ڕێژەیا ڤایرۆسێ HIV بهێتە دەستنیشانکرن بلەزتر ژ هەردوو پشکنینێن Antibody Test ، HIV Antibody/Antigen Test




**بۆچی پێدڤییە پشکنینا ڤایرۆسێ Human Immunodeficiency Virus (HIV) بهێتە ئەنجامدان:**

پشکنینا HIV دهێتە ئەنجامدان ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڤایرۆسێ HIV، ڤایرۆسێ HIV دبیتە ئەگەرێ نەخۆشییا ئایدزێ AIDS (acquired immunodeficiency syndrome) ، کەسێن تووشبوویی ب نەخۆشییا ئایدز AIDS تووشی کێمبوونا خانەیێن سیستەمێ بەرگرییا لەشی دبن و ب ئاشکەرا مەترسی ل سەر ژیانا وان پەیدا دبیت و دبیت تووشی چەندین

نەخۆشـییێن دی یێن ترسـناك و دژوار بین وەكی: (هەوكرنێن دۆمدرێژ، هەوكرنێن ڕێڤیکان، چەندین جۆرێن پەنجەشـێرێ). بەلێ ل دەمێ درەنگ زانینا تووشـبوونێ ب ڤایرۆسێ HIV دبیت هندەك دەرمانێن پالپشـتكەر بۆ نەخۆشـی بهێنە دان ژ بۆ پشـتەڤانیكرن و بهێزكرنا سیستەمێ بەرگرییا لەشی ژ بۆ پاراستن ژ تووشبوونێ ب نەخۆشییا ئایدزێ AIDS.

کەنگی پێدڤییە پشـكنینا ڤایرۆسـێ Human Immunodeficienc Virus (HIV) بهێتە ئەنجامدان:

باشـترە هەر كەسـەك د ناڤبەرا ژییێ 13 هەتا 64 سـالییێدا پشـكنینا ڤایرۆسـێ HIV ئەنجامبدەت، ڤایرۆسـێ HIV دهێتە ڤەگوهاسـتن ب ڕێكا بەركەڤتن ل گەل خوینێ یان كریارا سێكسی(جووتبوونێ) ل گەل كەسێ تووشبووی ب ڤایرۆسی.



هندەك ژ بارودۆخێن دبنە ئەگەرێ ڤەگوهاستنا ڤایرۆسێ HIV:

1. ل دەمێ رەگەزێ نێر كریارا سێكسی ل گەل رەگەزێ نێر دكەت.
2. ل دەمێ ئەنجامدانا كریارا سێكسی ل گەل كەسێ تووشبوویی ب ڤایرۆسی.
3. ل دەمێ ئەنجامدانا كریارا سێكسی ل گەل زێدەتر ژ ئێک كەس یان ژی كریارا سێكسی یا ب كۆم(كومەڵ).
4. ل دەمێ هەبوونا گۆمانا بكارهینانا دەرزییێ ژ بۆ كەسێ ساخلەم بەری هینگێ ژ بۆ كەسێ تووشبوویی ب ڤایرۆسی هاتبیتە بكارهینان.
5. ئەگەر ژن یا ب دووگیان بیت و تووشبوویی بیت ب ڤایرۆسی ئەگەر یێ هەی ڤایرۆس بهێتە ڤەگوهاستن ژ بۆ زارۆكی ل دەمێ ژدایكبوونێ یان ل دەمێ شیردانێ.



هندەك ژ نیشانێن تووشبوون ب ڤایرۆسێ HIV:

1. تا.
2. خوهدانا ب شەڤ.
3. هەوكرن.
4. هەستكرن ب ماندیبوونێ.
5. ئێشانا گەهـ و ماسۆلكەیان.
6. مەزنبوونا Lymph Nodes
7. سەرئێشان.

### هندەك ژ نیشانێن تووشبوون ب نەخۆشییا ئایدزێ AIDS:

1. ژدەستدانا کێشا لەشی.
2. بەردەوامبوونا تایێ.
3. خوهدانا ب شەڤ.
4. هەستکرن ب ماندیبوونەکا زۆر و بێی هەبوونا هۆکارەک دیارکری.
5. بەردەوامبوونا زکچوونێ ژ بۆ زێدەتر ژ ماوەیێ هەفتییەکێ.
6. هەوکرنا ڕێڤیکان.




### پشکنینا ڤایرۆسێ HIV ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Human Immunodeficiency Virus Test
- HIV Test
- HIV
- HIV antibody/antigen Tests
- HIV-1 and HIV-2 Antibody and Antigen Evaluation
- Human Immunodeficiency Virus Antibody Test
- HIV Antibody Test

## پشکنینا زیکا ڤایرۆس Zika Virus Test

زیکا هەوکرنەکا ڤایرۆسییە ب ڕێکا مێشان بەلاڤەدبیت، هەروەسا زیکا ڤایرۆس دهێتە ڤەگوهاستن ل دەمێ کرنا کریارا سێکسی دگەل کەسێ تووشبووی ب ڤایرۆسی یان ب ڕێکا ئافرەتا دووگیان ژ بۆ زارۆکی. ڤایرۆسێ زیکا پتر ل جهێن کەش و هەوایێ خۆلگەیی هەی دهێتە دیتن. پتریا کەسێن تووشبووی ب ڤایرۆسی نیشان ل دەڤ پەیدانابن یان هندەک نیشانێن کێم ژ بۆ چەند ڕۆژێن کێم ل دەڤ دیاردبن، بەلێ دبیت ل دەمێ ئافرەت یا ب دووگیان بیت و تووشبووی بیت ب ڤایرۆسێ زیکا مەترسییێن مەزن پەیدابکەت، ل دەمێ تووشبوون ب ڤایرۆسێ زیکا د ماوەیێ دووگیانیێدا د شیاندایە ببیتە ئەگەرێ ئاریشەیێن زکماکی وەکی تووشبوون ب بارودۆخێ Microcephaly ژ بۆ زارۆکی، بارودۆخێ Microcephaly د شێت کارتێکرنێن ب هێز ل سەر گەشەیا مەژییێ زارۆکی بکەت د زکێ ئافرەتا دووگیاندا، هەروەسا ل دەمێ تووشبوون ب زیکا د ماوەیێ دووگیانیێدا د شیاندایە ببیتە ئەگەرێ ئاریشەیێن زکماکی یێن دیتر وەکی Miscarriage, Stillbirth. د هندەک بارودۆخێن دەگمەندا زارۆک و پێگەهشتی ژی تووشدبن ب زیکا ڤایرۆس و تووشبوون ب نەخۆشیەکێ ب ناڤێ Guillain-Barré syndrome (GBS)، بارودۆخێ GBS دبیتە ئەگەر ژ بۆ هندێ سیستەمێ بەرگرییا لەشی هێرش بکەتە سەر بەشەک ژ سیستەمێ دەمارەخانەیان.



## بۆچی پێدڤییە پشکنینا زیکا ڤایرۆس بهێتە ئەنجامدان:

دێ پێدڤی پشکنینێ بی ئەگەر یا ب دووگیان بی و تە گەشت ژ بۆ ئەوان جهان کربیت یێن پتر مەترسییا تووشبوون ب ڤایرۆسی لێ هەبن، یان ئەگەر یا ب دووگیان بی و کریارا سێکسی دگەل کەسەکی ئەنجام دابیت هەلگرێ ڤایرۆسی بیت یان گەشت ژ بۆ ئەوان جهان کربیت یێن پتر مەترسییا تووشبوونێ ب ڤایرۆسی لێ هەی.

## کەنگی پێدڤییە پشکنینا زیکا ڤایرۆس بهێتە ئەنجامدان:

هەر چەندە ل دەمێ هەبوونا تووشبوون ب زیکا ڤایرۆس ب شێوەیەکێ گشتی چ نیشان ل سەر کەسێ تووشبووی دیارنابن، بەلێ ل دەمێ هەبوونا نیشانێن تووشبوون ب ڤایرۆسێ زیکا پێدڤییە پشکنینا Zika Virus بهێتە ئەنجامدان.

## ژ نیشانێن تووشبوون ب زیکا ڤایرۆس:



1. تا.
2. سەرئێشان.
3. سۆربوونا چاڤان.
4. ئێشانا گەهان.
5. ئێشانا ماسۆلکەیان.
6. هەستیارییا پیستی.

### ئەرێ ڤایرۆسێ زیکا دهێتە ڤەگوهاستن ژ کەسەکی بۆ کەسەکێ دیتر؟

بەلێ. دشیاندایە بهێتە ڤەگوهاستن ب رێکا ئافرەتا دووگیان ژ بۆ زارۆکی، هەروەسا ب رێکا سێکسی دگەل کەسێ تووشبووی ب ڤایرۆسی، ل دویڤ دەزگەهێ CDC باشترە ئافرەتەکا دووگیان کۆندومان ب کاربینیت ل دەمێ کریارا سێکسی دگەل کەسەکێ گومان لێکری دکەت ب تایبەت ل دەمێ گەشت کربیت ژ بۆ ئەوان جهێن پتر مەترسییا تووشبوونێ لێ هەی یان ئەگەر ل ئەوان جهان بژین، د هندەک بارودۆخێن دەگمەندا ئەگەرێ ڤەگوهاستنا ڤایرۆسی یا هەی ل دەمێ بەخشینا خوینێدا یان ل دەمێ چاندنا ئەندامێن لەشی. ل دویڤ راپۆرتەکێ ل وەلاتێ بەرازیل ڤایرۆس یێ هاتییە ڤەگوهاستن ب رێکا وەرگرتنا خوینێ.

### دێ چەوا خۆ پارێزین ژ تووشبوون ب زیکا ڤایرۆس؟

د نوکەدا نە ڤاکسین نە ژیک چارەسەرییەکا بنەرەت و ئێکلاکەر ژ بۆ ڤایرۆسێ ناڤبری نینە، ژ بۆ خۆ پاراستن ژ ڤایرۆسی باشترە خۆ ب پارێزین ژ پێڤەدانا مێشان وەک ل بەر کرنا جلوبەرگێن درێژ(لەشێ مروڤی ب باشی دیارنەکەت) و هەروەسا خوارن و ڤەخوارنێن ب کاردهینی ژ مێشان دویربکە و بلا د پاراستی بن و...هتد، ب تایبەت ل دەڤەرێن پتر مەترسییا تووشبوونێ ب ڤایرۆسی هەی.

### پشکنینا زیکا ڤایرۆس ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Zika Virus Test
- Zika Antibody Test
- Zika RT-PCR Test
- Zika Test

## پشکنینا ڤایرۆسێ Human Papillomavirus Test - HPV

مفا ژ پشکنینا ڤایرۆسێ Human Papillomavirus دهێته وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڤایرۆسێ HPV ل دەڤ ژنان، ڤایرۆسێ HPV کورتکرییا ڤایرۆسێ پاپیلوما مروڤە، ژ بەربەلاڤترین جۆرێن نەخوشییێن دهێنە ڤەگوهاستن ب ڕێکا سێکسی دهێنە هژمارتن، هەر چەندە زەلام ژیک تووشی ڤایرۆسێ HPV دبن بەلێ ب شێوەیەکێ گشتی نا هێتە پشنیارکرن پشکنینا ڤایرۆسێ HPV بهێتە ئەنجامدان ژ لایێ زەلامانڤە ژبەر کو هەتا نوکە هیچ پشکنینەکا HPV ژ بۆ زەلامان نەهاتییە پەسەندکرن ژ لایێ FDA ڤە و دگەل بۆرینا دەمی بێی هەبوونا هیچ نیشانەیەکێ دێ چارەسەربن، پتریا ژنێن تووشی ڤایرۆسێ HPV دبن تووشی هیچ نیشانەیەک یان ئاریشەیەکا تەندرۆستی نابن، پتریا ئەو ژنێن تووشدبن ل ماوەیێ سالەک هەتا دوو سالاندا ڤایرۆس ل دەڤ نامینیت بەلێ هندەک جاران دشیاندایە پتر بمینیت، هندەک جاران هەوکرنێن دۆمدرێژ دبنە ئەگەرێ تووشبوون ب پەنجەشێرێ، پتریا جاران پەنجەشێرا هێلکەدانێ ل دەڤ ئافرەتان ژ ئەگەرێ ڤایرۆسێ HPV یە، هەروەسا ل دەمێ تووشبوون ب ڤایرۆسێ HPV دشیاندایە ببیتە ئەگەرێ تووشبوون ب پەنجەشێرا کۆمێ (ئەندامێ پشتێ، المستقیم، Rectal)، زێی (المبهل)، کۆئەندامێ نێرینە، دەڤ و هەروەسا حەفکێ.



### بۆچی پشکنینا ڤایرۆسێ HPV دهێتە ئەنجامدان؟

پشکنینا ڤایرۆسێ HPV دهێتە ئەنجامدان ژ بۆ دەستنیشانکرنا جۆرێن ڤایرۆسێ HPV یێن دبنە ئەگەرێ پەنجەشێرا هێلکەدانێ ل دەڤ ئافرەتان، پتریا جاران پشکنینا ڤایرۆسێ HPV دگەل پشکنینەکا دیتر دهێتە ئەنجامدان و دهێتە بناڤکرن ب Pap Smear پشکنینەکا زۆر یا گرنگە پرۆسێسەکە ل خانەیێن نەئاسایی یێن دبنە ئەگەرێ پەنجەشێرا هێلکەدانێ ل دەڤ ئافرەتان دەستنیشان دکەت و ژ لایێ نۆژدارا تایبەتمەندا ئافرەتانڤە سامپڵ دهێتە وەرگرتن ژ ڕەگەزێ مێ و دهێتە هنارتن ژ بۆ تاقیگەهێ.



### کەنگی پێدڤییە پشکنینا ڤایرۆسێ HPV بهێتە ئەنجامدان؟

باشترە هەر ئافرەتەک د ژییێ ٢٥ سالییێ و د سەردا هەر پێنج ساڵان جارەکێ پشکنینا ڤایرۆسێ HPV ب هەڤبەشی دگەل پشکنینا Pap Smear ئەنجام بدەن.

**تێبینی:**

**پێدڤییە ئافرەت دوو ڕۆژان بەری ئەنجامدانا پشکنینێ دویربکەڤیت ژ هندەک کاران ژوان.....**

- ☒ **ب کارهینانا دەرمانێن زێی (المبهل).**
- ☒ **ئەنجامدانا کریارا سێکسی.**



**ڕامانا ئەنجامێن پشکنینا ڤایرۆسێ HPV:**

**- ل دەمێ هەبوونا ئەنجامێ نەرێنی واتە نەڤەدیتنا جۆرێن ڤایرۆسێ HPV یێ مەترسیدارە.**

**- ل دەمێ هەبوونا ئەنجامێ ئەرێنی واتە ڤەدیتنا جورێ ڤایرۆسێ HPV یێ مەترسیدارە بەلێ مەرج نینە نەخوش تووشی پەنجەشێرێ ببیت، بەلێ دبیت ئاماژە بیت ژ بۆ تووشبوونێ دداهاتوویدا د ڤان بارودۆخاندا نۆژدارێن تایبەتمەند دێ داخوازا هندەک پشکنینێن دیتر کەن ژ بۆ شرۆڤەکرنا بارودۆخی وەکی Pap Smear یان Cervical Biopsy و...هتد.**

## پشکنینا ڤایرۆسێ HPV ب ڤان شێوازان دهێته نڤیسین:

- **Human Papillomavirus Test**
- **HPV Test**
- **HPV**
- **Human Papillomavirus**
- **Human Papilloma**
- **Papillomavirus Test**
- **Genital Human Papillomavirus Test**
- **High risk HPV Test**
- **HPV DNA Test**
- **HPV RNA Test**



Human Papillomavirus (HPV)

## پشکنینا ڤایرۆسێ هێرپس Herpes (HSV) Test

مفا ژ پشکنینا HSV دهێته وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڤایرۆسێ هێرپس، هێرپس هەوکرنەکا پیستییە ژ ئەگەرێ تووشبوونێ ب ڤایرۆسێ هێرپس سێمپلکسە، ڤایرۆسێ هێرپس دبیتە ئەگەرێ پرسکان یان برینێن ب ئازار د بەشێن جوداییێن لەشیدا، پتریا جاران ڤایرۆسێ HSV ل سەر دەڤ و لێڤ و ئەندامێ زاوزێ دهێتە دیتن ، دشیانێن ڤایرۆسێ هێرپسدا هەیە تووشی مێشک و بڕبڕەیا پشتێ ژیک ببیت، دبیتن ڤایرۆسێ هێرپس د هندەک بارودۆخاندا مەترسییا تووشبوون ب ڤایرۆسێ HIV و نەخوشییێن ب ڕێکا سێکسی دهێنە ڤەگوهاستن زێدەتر لێ بکەتن، هەتا نوکە هیچ چارەسەرییەکا دووماهی و ڤاکسین ژ بۆ ڤی جورێ ڤایرۆسی نەهاتینە ڤەدیتن.



**جۆرێن ڤایرۆسێ هێرپس:**

1. **HSV-1:** پتریا جاران دبیته ئەگەرێ هەبوون و تووشبوون ب پرسکان و برینان ل دەڤ و لێڤان ژبەر هندێ دهێته نیاسین ب (هێرپسا دەڤ و لێڤان).
2. **HSV-2:** پتریا جاران دبیته ئەگەرێ هەبوون و تووشبوون ب پرسکان و برینان ل سەر ئەندامێ زاوزێ ژبەر هندێ دهێته نیاسین ب (هێرپسا ئەندامێ زاوزێ).

**رێکێن ڤەگوهاستنا ڤایرۆسێ HSV:**

1. راستەوخو ب رێکا پیستێ لەشی دگەل جهێ برین لێ پەیدابووی.
2. ب رێکا کریارا سێکسی (ئەندامێ زاوزێ).
3. ب رێکا کریارا سێکسی ژ لایێ کۆمێ (پشتێ، المستقیم، Rectal) ڤە.
4. ماچکرن.
5. کێم جاران ژ دەیکا دووگیان یا تووشبووی ب ڤایرۆسی ژ بۆ زارۆکی ل دەمێ ژدایکبوونێ.

**بۆچی پشکنینا ڤایرۆسێ هێرپس دهێته ئەنجامدان؟**

1. ژ بۆ زانینا برینێن دەڤ و ئەندامێ زاوزێ ئەرێ ژ ئەگەرێ ڤایرۆسێ HSV نە یان ژێک نە.
2. دەستنیشانکرنا هەوکرنێن ڤایرۆسێ HSV ل دەڤ ژنێن دووگیان.
3. ژ بۆ زانینا تەندرۆستییا زارۆکێن ژنوی ژدایک بووی ئەرێ تووشبوویە ب ڤایرۆسێ هێرپس یان نە(ئەگەر ئافرەتا دووگیان تووشبووی بیت ب ڤایرۆسی دشیاندایە بهێتە ڤەگوهاستن ژ بۆ زارۆکی ل دەمێ ژدایکبوونێدا).

## کەنگی پێدڤییە ڤایرۆسێ هێرپس بهێتە ئەنجامدان؟

ل دویڤ سەنتەرێ کۆنترۆلکرن و پاراستنا نەخوشییان CDC دبێژیت کەسێن نیشانێن تووشبوون ب ڤایرۆسێ HSV نەبن پێدڤی ب پشکنینێ نینە، بەلێ دبیتن تە پێدڤی ب پشکنینا ڤایرۆسێ HSV بیت ل دەمێ.....

1. هەبوونا نیشانێن ڤایرۆسێ هێرپس وەکی پرسک یان برین ل سەر دەڤ و ئەندامێ زاوزێ.

2. هەڤژینێ/ا تە تووشبووی بیت ب ڤایرۆسێ هێرپس.

3. ئەگەر یا ب دووگیان بی ژ بۆ پاراستنا تە و زارۆکی هەردوویان ژبەر کو ل دەمێ ئافرەتا دووگیان تووشبووی بیت ب ڤایرۆسێ هێرپس دشیاندا هەیە ببیتە ئەگەرێ ڤەگوهاستنا ڤایرۆسی ل دەمێ ژدایکبوونێ ژ بۆ زارۆکی.

4. هەڤژینێ/ا تە بەری نووکە تووشبووی بیت ب ڤایرۆسێ هێرپس یان هەبوونا نیشانێن ڤایرۆسی ل سەر ئەندامێ زاوزێ.



دێ پێدڤی ب پشكنینا ڤایرۆسێ هێرپس بی ل دەمێ هەبوونا مەترسییێن تووشبوونێ ب نەخوشییێن ب رێكا سێكسی دهێنە ڤەگوهاستن، ژوان....

1. كرنا كریارا سێكسی یا ب كۆمەڵ (ب كۆم).
2. هەڤژینێ تە كریارا سێكسی دگەل هەمان رەگەزێ خۆ ئەنجام بدەت(نێر دگەل نێری).
3. هەڤژینێ/ا تە تووشبووی بیت ب ڤایرۆسێ HSV یان نەخوشییێن دیتر یێن ب رێكا كریارا سێكسی دهێنە ڤەگوهاستن.

د بارودۆخێن گەلەكێن دەگمەندا د شیانێن ڤایرۆسێ HSV دا هەیە ببیتە ئەگەرێ هەوكرنا پەردەیا مێشكی و هەوكرنا مێشك و بڕبڕەیا پشتێ ب بارودۆخێن گەلەک مەترسیدار دهێنە ب ناڤكرن، دێ پێدڤی ب پشكنینا ڤایرۆسێ HSV بی ل دەمێ هەبوونا نیشانێن تووشبوون ب تێكچوونێن مێشک و بڕبڕەیا پشتێ ژوان....

1. سەر ئێشانەكا بهێز.
2. تا.
3. رەقبوونا ملی.
4. گێژبوون.
5. هەستیاری ب روناهییێ.



رامانا ئەنجامێن پشكنینا ڤایرۆسێ هێرپس:

- ل دەمێ ئەنجامێ پشكنینێ نەرێنی دەركەڤت واتە ڤایرۆسێ HSV نەهاتە دیتن ب رامانا نەبوونا ڤایرۆسییە، بەلێ گەلەک جاران دبیتن تووشبووی بی ب ڤایرۆسی بەلێ د پشكنینێدا نەهاتیە دەستنیشانكرن دبیت ژ ئەگەرێ كێمیا ڤایرۆسییە د ناڤ سامپڵێدا یان ژێک ئەو

سامپلێ هاتییە وەرگرتن ژ نەخوشی ب دروستی نەهاتییە وەرگرتن ب تایبەتی ژیک ل دەمێ هەبوونا نیشانێن ڤایرۆسی باشترە دووبارە پشکنین بهێتە ئەنجامدان ژ بۆ پشتراستبوون ژ ئەنجامێ پشکنینێ.

- ل دەمێ ئەنجامێ پشکنینێ ب ئەرێنی دەرکەڤت واتە ڤایرۆسێ HSV هاتییە دیتن، ل دەمێ هەبوونا نیشانێن ڤایرۆسی ب ڕامانا تووشبوون ب ڤایرۆسییە د نوکەدا، ل دەمێ نەبوونا نیشانێن ڤایرۆسی ل سەر نەخوشی و ئەنجامێ پشکنینێ ب ئەرێنی دەرچوو ب ڕامانا تووشبوون ب ڤایرۆسی د ڕابردوویدا ڕادگەهینیت.

پشکنینا ڤایرۆسێ هێرپس ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Herpes Test
- HSV Test
- Herpes Simplex Viral Culture Test
- HSV-1 antibodies Test
- HSV-2 antibodies Test
- HSV DNA Test



## پشکنینا ڤایرۆسێن Respiratory Syncytial Virus Tests - RSV

مفا ژ پشکنینا ڤایرۆسێ RSV دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڤایرۆسێ Respiratory Syncytial، RSV کورتکرییێ ڤایرۆسێ کۆئەندامێ هەناسەدانێیە، کۆئەندامێ هەناسێ ژ هەردووک سیهان، دفن و گەورییێ پێکدهێتن، ڤایرۆسێ RSV ب ساناهی ژ کەسەک بۆ کەسەک دیتر دهێتە ڤەگوهاستن، پتریا زارۆکان د تەمەنێ دوو سالییێدا تووشی ڤایرۆسێ RSV دبن پتریا جاران نیشانێن سڤک وەکی سەرما و پەرسیڤێ بخوڤەدگریت، بەلێ د شیانێن ڤایرۆسێ RSV دا هەیە ببیتە ئەگەرێ کێشەیێن ڕژد د زارۆکێن زۆر بچویک یان کەسێن ب تەمەن یێن سیستەمێ بەرگرییا لەشێ وان یا لاواز.



**بۆچی پشکنینا ڤایرۆسێ RSV دهێته ئەنجامدان؟**

پتریا جاران پشکنینا ڤایرۆسێ RSV ژ بۆ زارۆک و کەسێن ب تەمەن دهێته ئەنجامدان یان ب شێوەیەکێ گشتی یێن سیستەمێ بەرگرییا لەشێ وان یا لاواز، پتریا جاران دهێته نیاسین ب (وەرزێ ڤایرۆسێ RSV) دهێته ئەنجامدان، ل وەلاتەک ژ بۆی وەلاتەک دیتر جودایە بەلێ ل وەلاتەکێ وەکی ویلایەتێن ئێکگرتی یێن ئەمریکا ژ ناڤەڕاستا پایزێ دەستپێدکەت و ل دەستپێکا بهارێدا ب دوماهیک دهێت د شیاندایە ڤایرۆسێ RSV وەکو ڤایرۆسێ وەرزی بهێته بنافکرن.




**کەنگی پێدڤییە پشکنینا ڤایرۆسێ RSV بهێته ئەنجامدان؟**

پتریا جاران زارۆکێن پێگەهشتی و کەسێن تەندرۆست و تەمەن گونجایی پێدڤی ب ئەنجامدانا پشکنینا ڤایرۆسێ RSV ناکەن ژبەر کو پتریا جاران ل دەمێ تووشبوونێ ب تنێ هندەک نیشانەیێن دەمکی و سڤک دەردکەڤن ژوان وەکی ئاڤ هاتن ژ دفنێ، بێهنژین، سەرئێشانەکا سڤک، بەلێ ل دەمێ زارۆکێن ژ نوی ژدایکبووی و نەگەهشتی و کەسێن ب تەمەن یێن سیستەمێ بەرگرییا لەشێ وان یا لاواز یان کومەکا نەخوشییان هەین ل دەمێ هەبوونا نیشانێن هەوکرنێ پێدڤییە پشکنینا RSV ئەنجام بدەن ژوان نیشانان.....

1. تا.
2. کۆخکەکا توند.
3. ب لەز هەناسەدان، ب تایبەت ل دەڤ زارۆکان.

4. هەبوونا کێشەیێن هەناسەدانێ.
5. گوهۆڕینا رەنگێ پیستێ لەشی ژ بۆی ڕەنگێ ڕەش.

ڕامانا ئەنجامێن پشکنینا ڤایرۆسێ RSV:

- ئەگەر ئەنجامێ پشکنینێ نەرێنی بوو ب ڕامانا نەبوون و نەڤەدیتنا ڤایرۆسێ RSV یە، پتریا جاران ل ڤی دەمی دبیتن نیشان ژ ئەگەرێ ڤایرۆسەکێ دیتر ڤەبن.

- ئەگەر ئەنجامێ پشکنینێ ئەرێنی بوو ڕامانا هەبوونا هەوکرنا ڤایرۆسێ RSV یە، دبیتن ل دەمێ زارۆکەکێ نوی بووی یان کەسەک ب تەمەن تووشی ڤایرۆسێ RSV بن ل نەخوشخانەیێ بهێنە نڤاندن و چارەسەرکرن ل ژێر ڕاوێژا نۆژدارێن تایبەتمەندڤە، دبیتن نەخۆش پێدڤی ب ئوکسجین و ئامیرەیێ هەناسەدانێ بیت ئەوێ دهێتە ب ناڤکرن ب ڤێنتلێتەر (Ventilator).



پشکنینا ڤایرۆسێ RSV ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Respiratory Syncytial Virus Tests
- RSV Tests
- Respiratory Syncytial Antibody Test
- RSV Rapid Detection

## پشکنینا ڤایرۆسێن Measles and Mumps

هەردووک هەوکرنێن Measles - Mumps ژ ئەگەرێ ڤایرۆسێن وەکی ئێک تووش دبن و پتریا جاران تووشی زارۆکان دبن و ب ساناهی دهێنە ڤەگوهاستن ژ کەسەکی بۆ کەسەکێ دیتر، پتریا جاران ل دەمێ تووشبوون ب هەوکرنێن Measles - Mumps د ماوەیێ ١٤ ڕۆژاندا یان کێمتر چارەسەردبن، بەلێ دشیانێن هەوکرنێن Measles - Mumps دا هەیە ببنە ئەگەرێ ئاریشەیێن مەزنێن تەندرۆستی ژوان هەوکرنا مێشکی (وەرمتنا مێشک و بڕبڕەیا پشتێ)، ژ ئەگەرێ تووشبوون ب Measles نەخوش هەست پێ دکەت تووشبوویە ب سەرمایەکا توند یان ئەنفلەوانزایێ و دبیتە ئەگەرێ پنیێن سۆر ل سەر پیستی پتریا جاران ژ سەروچاڤان دەستپێدکەن و هەمی بەشێن لەشی پاشی ڤەدگرن، هەروەسا ژ ئەگەرێ Mumps ێ نەخۆش هەست ب تووشبوون ب ئەنفلەوانزایێ دکەت و دبیتە ئەگەرێ وەرمتنا ب ئازار یا لیکە ڕژێنان.



## بۆچی پشکنینا هەوکرنێن Measles - Mumps دهێنە ئەنجامدان؟

1. ژ بۆ هندێ بهێتە زانین ئەرێ نەخوشی یا چالاکە یان نە ل دەمێ هەبوونا نیشانێن هەوکرنێ.
2. ژ بۆ زانینا بەرگرییێ ل دژی هەوکرنان ژبەر کو پێشوەخت ڤاکسین وەرگرتینە یان ژیک تووشبوویە ب ئێک ژ جۆرێن ڤایرۆسی.
3. ژ بۆ رێڤەبەرییێن گشتی یێن تەندرۆستی ژ بۆ پشتراستبوون ژ رێژەیا بەلاڤبوونێ د ناڤ کومەلگەهاندا.

## کەنگی پێدڤییە پشکنینا هەوکرنێن Measles - Mumps بهێنە ئەنجامدان؟

ل دەمێ هەبوونا نیشانێن تووشبوون ب هەوکرنێن Measles - Mumps پێدڤییە پشکنین بهێتە ئەنجامدان.

## نیشانێن تووشبوون ب هەوکرنا Measles:

1. کۆخک.
2. تایەکا توند.
3. خۆریان.
4. سۆربوونا چاڤی.
5. هاتنا خارێ یا ئاڤێ ژ دفنێ.
6. پەلەیێن سپی یێن بچویک د ناڤ دەڤیدا.



**نیشانێن تووشبوون ب هەوکرنا Mumps:**

1. وەرمتن.
2. ئێشانا شەویلگێ.
3. تا.
4. سەر ئێشان.
5. ئێشانا گوها.
6. کێمبوونا حەزا خوارنێ.
7. ئێشانا ماسۆلکەیان.
8. داعیرانا ب ئازار(لبلع المؤلم).




سەنتەرێ کۆنترۆلکرن و خۆپاراستن ژ نەخۆشییان (CDC) پێشنیار دکەن زارۆک دوو ژەمێن ڤاکسینێ MMR بدانن، MMR کورتکرییا هەرسێک ڤایرۆسێن ( Measles,

ژەمەكێ ڤاكسینی پشتی ژدایكبوونێ و ژەمێ دوویێ بەری زارۆك (Mumps, Rubella دەست ب خواندنێ بكەن، ب شێوەیەكێ گشتی باشترین چارەسەری ل دژی ڤایرۆسان دانانا ڤاكسینییە.




پشكنینا هەردووك هەوكرنێن Measles - Mumps ب ڤان شێوازان دهێنە نڤیسین:

- Measles and Mumps Tests
- Measles immunity Ttest
- Mumps immunity Test
- Measles Blood Test
- Mumps Blood Test
- Measles Viral Culture
- Mumps Viral Culture



Dep. Vitamin Tests

## پشکنینا ڤیتامین D

ڤیتـامین D ب بنچینە دهێتە دانـان ژ بۆ بهێزبوونـا ددان و هەســتییـان، ڤیتـامین D هاریکارییا لەشــی دکەت ژ بۆ هەلمژینا کالســیوومی و هەروەســان کالســیووم ب گرنگ و پێدڤی دهێتە زانین ژ بۆ تەندرۆستبوونا هەستییان ڕێژەیا هەرە زۆر ژ کالسیوومی د لەشیدا د ناڤ هەســتییاندا دهێتە دیتن هەر ژ بەر هندێ کێمییا ڤیتامین D پەیوەندییا ڕاســتەوخۆ هەیە ل گەل نەرمبوون و لاوازبوونا هەســتی، هەروەســا ب شــێوەیەکێ گشــتی ڤەکۆلەر گەهشــتینە وێ چەندێ ڤیتامین D ڕۆلەکێ گرنگ یێ هەی د پترییا کار و چالاکییێن د ناڤ لەشیدا دهێنە ئەنجامدان.

ڤیتامین D ب دوو شـێوەیان یێ هەی Vitamin D2 و Vitamin D3، Vitamin D2 ب شـێوەیەکێ سـەرەکی ژ لایێ خوارنێڤە دهێتە بدەستڤەهینان، هەروەسا Vitamin D3 ب شـێوەیەکێ سـەرەکی ژ لایێ لەشـیڤە دهێتە دروستکرن دەمێ لەش دکەڤیتە بەر تیشکا ڕۆژێ و هەروەســا ژ هندەك خوارنـان ب دەســت دکەڤیت، د زڤڕۆکا خوینێدا هەردوو Vitamin D2 وVitamin D3 دهێنە گوهۆڕین ژ بۆ ڤیتـامین D و دهێتە نیـاســین ب hydroxyvitamin D, 25(OH)D   25 ، مفا ژ پشــکنینا ڤیتامین D دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڕێژەیا 25(OH)D د ناڤ خوینێدا، نەئاساییبوونا ڕێژەیا پشکنینێ ئاماژەیە ژ بۆ هەبوونا ئاریشەیێن تەندرۆستی یێن گرێدایی هەستییان و سیستەمێ خوارنێ و ...هتد.




- نێزیکی 80% ژ کەســێن پشــکنینا ڤیتامین D ئەنجام ددەن کێشــەیا کێمییا ڤیتامینی هەیە.

**ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا Vitamin D:**

| باروددۆخ | ڕێژەیێن ئاسایی | یەکە |
|---|---|---|
| ڕێژەیا گەلەك كێم | د ناڤبەرا 20 - 0 | ng/ml |
| نێزیك ژ ڕێژەیا ئاسایی | 21 - 29 | ng/ml |
| ڕێژەیا ئاسایی | 30 – 70 | ng/ml |
| ڕێژەیا بلند و ب مەترسی | بلندتر ژ 70< | ng/ml |

**هۆکارێن دبنە ئەگەرێ بلندبوونا ڕێژەیا Vitamin D د ناڤ لەشیدا:**

1. گەلەک مانا ل بەر تیشکا ڕۆژێ.
2. بلندبوونا ڕێژەیا کالسیوومی د ناڤ لەشیدا.
3. خوارنا ڕێژەیەکا زۆر ژ سەرچاوەیێن دەولەمەند ب ڤیتامین D
4. خوارنا ڕێژەیەکا زۆر ژ دەرمانێن ڤیتامین D یێن دبنە ئەگەرێ بلەز بلندبوونا ڕێژەیا ڤیتامین D د ناڤ لەشیدا.
5. بکارهینانا هندەك ژ جۆرێن دەرمانان وەکی Rifampin

**هۆکارێن دبنە ئەگەرێ کێمبوونا ڕێژەیا Vitamin D د ناڤ لەشیدا:**

1. کێم بەرکەڤتن ل گەل تیشکا ڕۆژێ.
2. هەبوونا ئاریشەیێن گولچیسکان.
3. کێم خوارنا سەرچاوەیێن دەولەمەند ب ڤیتامین D
4. تۆخییا ڕەنگێ پیستی Pigment Melanin دبیتە ئەگەر پیست کێمتر ڕێژەیا پێدڤی ژ ڤیتامینی وەربگریت.
5. بکارهینانا هندەك ژ جۆرێن دەرمانان وەکی Steroids



هندەك ژ دەرمانێن دبنە ئەگەرێ کێمبوونا ڕێژەیا ڤیتامین D د ناڤ لەشیدا:

- Laxatives
- Steroids (such as prednisone)
- Cholesterol-lowering drugs (such as cholestyramine and colestipol)
- Seizure-control drugs (such as phenobarbital and phenytoin)
- A tuberculosis drug (rifampin)
- A weight-loss drug (orlistat)

نیشانێن بلندبوونا ڕێژەیا Vitamin D د ناڤ لەشیدا:

1. کێمبوونا کێشا لەشی.
2. کێمبوونا حەزا خوارنێ.
3. هەلاڤێتن.
4. قەبزبوون.
5. بەردەوام هەستکرن ب ماندیبوونێ.
6. بەردەوام هەستکرن ب لاوازبوونێ.

نیشانێن کێمبوونا ڕێژەیا Vitamin D د ناڤ لەشیدا:

1. هەستکرن ب ماندیبوونێ.
2. پشتئێشان.
3. وەریانا پرچێ.
4. هەستکرن ب هەبوونا پەستانێ.
5. لاوازبوونا هەستییان.
6. ئێشانا گەهان.
7. بلندبوونا پەستانا خوینێ Hypertension
8. کێمبوونا بەگرییا لەشی.
9. گوهۆڕینا سرۆشتێ کەسی(تغیرات في المزاج).
10. هەبوونا ئاریشەیان د سیستەمێ هەرسکرنێدا.

ئەگەر ڕێژەیا ڤیتامین D زۆر یا کێم بیت و بۆ ماوەیەکێ درێژ ب کێمی بمینیت دبیت بارودۆخێن ترسناکێن تەندرۆستی ل دویڤ خۆ بهێلیت وەکی:

- زێدەکرنا ئەگەرێن مرنێ ب نەخۆشییێن دلی.
- دێ بیتە ئەگەرێ تووشبوونا زارۆکان ب ڕەبۆیێ.
- پەنجەشێر.




چارەسەرییا کێمبوونا ڕێژەیا ڤیتامین D:

چوونا بەر **تیشکا ڕۆژێ** ب شێوەیەکێ ڕاستەوخۆ سەرەکیترین و تەندرۆستترین ڕێکە ژ بۆ بلندبوونا ڕێژەیا ڤیتامین D د ناڤ لەشیدا، پاشان ب ڕێکا خوارنا سەرچاوەیێن دەولەمەند ب ڤیتامین D یان ژی ب ڕێکا بکارهینانا دەرمانان، بەلێ پێدڤییە دەرمان ل ژێر چاڤدێری و ڕاوێژا نۆژدارێن تایبەتمەندڤە بهێنە بکارهینان.



هندەك ژ سەرچاوەیێن دەولەمەند ب ڤیتامین D:

- پەنیر.
- شیر.
- زەرکا هێکێ.
- کڤارك.
- شەربەتا پرتەقالێ.
- ماسی، ڕوونێ ماسییێ.
- گۆشتێ سۆر.
- جگەر.




پشکنینا ڤیتامین D ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Vitamin D Test
- Vit.D Test
- Vitamin D
- D3
- 25 hydroxyvitamin D Test
- 25(OH)D Test

## پشکنینا ڤیتامین B12

مفا ژ پشـــکنینا B12 دهێته وەرگرتن ژ بۆ دەســـتنیشـــانکرنا ڕێژەیا ڤیتامین B12 د ناڤ خوینێدا، ناڤێ زانستی یێ ڤیتامین B12 (Cyanocobalamin) ـــە، ڕێژەیا زێدە ژ ڤیتامین B12 ب شـێوەیەکێ ڕاسـتەوخۆ ل گەل میزێ دچیتە ژ دەرڤەی لەشـی، ڤیتامین B12 کارێن گرنگ و پێدڤی د ناڤ لەشـیدا ئەنجام ددەت ژ وان دروسـتکرنا خرۆکێن سـۆرێن خوینێ، دروستکرنا DNA و تەندرۆستبوونا مێشکی و کارێ دەماران و ...هتد. گرنگە ژنێن دووگیان ئاگەهدار بن ژ ڕێژەیا ڤیتامین B12 د ناڤ لەشـیدا ژ بۆ پاراسـتن و تەندرۆسـتبوونا گیان و شێوەیێ زارۆکی، هەر ژ بەر هندێ پێدڤییە هەردوو ڕەگەز و د هەر ژییەکێدا ڕێژەیا پێدڤی ژ ڤیتـامین B12 وەربگرن چ ب ڕێکـا خوارنێ یان ب ڕێکا خوارنا دەرمانانڤە، بەلێ پێدڤییە دەرمـان ل ژێر چـاڤـدێرییـا نۆژدارێن تـایبەتمەندڤە بهێنە بکارهینان، هەر ژ بەر هندێ هەر بلنـدبوون یـان کێمبوونەك د ڕێژەیـا ئـاســـایی یـا ڤیتـامینیدا پەیدا ببیت دێ ئاریشـــەیێن تەندرۆستی ل دویڤ خۆ هێلیت.

### ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا ڤیتامین B12:

- 160 - 950 picograms per milliliter (pg/mL)



ب شێوەیەکێ گشتی ژ مفایێن هەبوونا ڤیتامین B12 د ناڤ لەشیدا:

1. هاریکارە ژ بۆ دروستبوون و ڕێکئێخستنا DNA د ناڤ لەشیدا.
2. هاریکارییا هەلمژینا ڤیتامین B9 دکەت.
3. ب مفایە بۆ هەرسێ.
4. ب مفایە بۆ ژنا دووگیان.
5. ب مفایە بۆ پیستێ لەشی و پرچێ.
6. ب مفایە بۆ نەخۆشییێن دلی.
7. ب مفایە بۆ کارێ مێشک و دەمارەکۆئەندامی.
8. ب مفایە بۆ دروستکرنا خرۆکێن سۆرێن خوینێ.
9. ڕیگرییێ ل تووشبوون ب کێم خوینییێ دکەت.
10. ڕیگرییێ ل پەنجەشێرێ دکەت.




نیشانێن کێمبوونا ڕێژەیا ڤیتامین B12 د ناڤ لەشیدا:

1. هەستکرن ب ماندیبوون و لاوازبوونێ.
2. کێم خوینی.
3. نەمانا حەزا خوارنێ.
4. کێمبوونا کێشا لەشی.
5. تیکچوونا بارودۆخێ دەروونی.
6. هەبوونا ئاریشەیان د دیتنێدا.
7. زکچوون.
8. هەستکرن ب فشارێ.

هندەك ژ بارودۆخێن تەندرۆســتی یێن دبنە ئەگەرێ کێمبوونا ڕێژەیا ڤیتامین B12 د ناڤ لەشیدا:

1. کێمبیا خوینێ ژ جۆرێ Pernicious Anemia
2. نەخۆشـیا گەنمی Celiac Disease (پشـکنینا نەخۆشـیا سـیلیاک (گەنم)ی ل بەشـێ پشکنینێن گرێدایی سیستەمێ بەرگریا لەشی دژی خۆ هاتییە بەحسکرن و شرۆڤەکرن ب شێوەیەکێ تێر و تەسەل).
3. نەخۆشـیا کرۆنس Crohn's Disease نەخۆشـییەکا بەرگریا لەشی دژی خۆیە، دبیتە ئەگەرێ هەبوونا هەوکرنێن دۆمدرێژ د کۆئەندامێ هەرسکرنێدا.
4. هەوکرنا گەدەی Atrophic Gastritis




ئەو کیژ مرۆڤن یێن مەترسیا تووشبوون ب کێمبوونا ڤیتامین B12 ل سەر هەی:

1. کەسێن ب تەمەن ب تایبەت ئەو کەسێن ژیێ وان ژ 60 سالییێ دەربازبووی.
2. زارۆک.
3. ئەو مرۆڤێن سیستەمێ Vegans (بەرهەمێن ئاژەلی ناخۆن) پەیڕەو دکەن.
4. ئەو مروڤێن سیستەمێ Strict Vegetarians پەیڕەو دکەن.
5. کەسێن نەخۆشییا شەکرێ ل دەڤ هەی.
6. ئەو مروڤن یێن سەرچاوەیێن دەولەمەند ب ڤیتامین B12 ناخۆن.



هندەك ژ دەرمانێن کارتێکرنێ ل ڕێژەیا ڤیتامین B12 دکەن د ناڤ لەشیدا:

- Chloramphenicol , Chloromycetin
- Proton pump inhibitors, such as Prilosec and Prevacid
- H2 receptor blockers, such as Tagamet, Pepcid, and Zantac
- Metformin, for diabetes

هندەك ژ سەرچاوەیێن دەولەمەند ب ڤیتامین B12:

- چەرەزات ب گشتی و ب تایبەت باهیڤ.
- شیر و پەنیر و بەرهەمێن ئاژەلی ب گشتی.
- کڤارك.
- هێك.
- گۆشتێ سۆر.
- گۆشتێ بالندەیان.
- ماسی.
- مریشك.
- جگەر.
- خوارنێن دەریایی.




پشکنینا ڤیتامین B12 ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Vitamin B12 Test
- B12 Test
- Cyanocobalamin Test

## پشکنینا ڤیتامین E

مفا ژ پشکنینا Vitamin E دهێته وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڕێژەیا ڤیتامین E دناڤ خوینێدا، هەروەسا ڤیتامین E دهێته نیاسین ب Tocopherol یان Alpha-tocophero، ڤیتامین E کارێن گرنگ دناڤ لەشیدا ئەنجامددەت ژوان هاریکارییا کارێ دەماره و ماسۆلکەیان دکەت و ڕێگریکرن ل خوینمەیینێ و هەروەسا سیستەمێ بەرگرییا لەشی بهێز دکەت. ڤیتامین E جورەکە ژ Antioxidant پێکهاتەیەکە خانەیان دپارێزیت ژ برینداربوونێ. پتریا خەلکی ڕێژەیا پێدڤی ژ ڤیتامین E ب ڕێکا خوارنان ب دەستڤەدهینن و ب شێوەیەکێ سرۆشتی ڤیتامین E دناڤ ڕێژەیەکا زۆر ژ خوارناندا هەیە ژوان کەسکاتی و چەرەزات و...هتد، ل دەمێ بلندبوون یان کێمبوونا ڕێژەیا ڤیتامین E دێ مروڤ تووشی چەندین ئاریشەیێن جوراوجۆرێن تەندرۆستی بیت.




### ڕێژەیێن ئاسایی یێن پشکنینا ڤیتامین E:

| تەمەن | ڕێژەیێن ئاسایی | یەکە |
|---|---|---|
| زارۆک | 3.0 - 18.4 | µg/mL |
| پێگەهشتی | 5.5 - 17.0 | µg/mL |

## کەنگی پێدڤییە پشکنینا ڤیتامین E بهێتە ئەنجامدان؟

ل دەمێ هەبوونا نیشانێن بلندبوون یان کێمبوونا ڕێژەیا ڤیتامین E دناڤ لەشیدا پێدڤییە پشکنینا ڤیتامین E بهێتە ئەنجامدان.

### نیشانێن بلندبوونا ڕێژەیا ڤیتامین E دناڤ لەشیدا:

1. زکچوون.
2. سەرئێشان.
3. هەلاڤێتن.
4. هەستکرن ب ماندیبوون و لاوازبوونێ.

### نیشانێن کێمبوونا ڕێژەیا ڤیتامین E دناڤ لەشیدا:

1. لاوازبوونا ماسۆلکەیان.
2. ب زەحمەت ڕێڤەچوون.
3. هەبوونا ئاریشەیان د دیتنێدا.
4. کێمبوونا هش و بیران.



## سەرچاوەیێن دەولەمەند ب ڤیتامین E:

- ئەڤوگادروو.
- سپیناخ.
- چەرەزات.
- کەسکاتی.
- هێک.
- خوارنێن دەریایی.




## ژ مفایێن ڤیتامین E دناڤ لەشیدا:

1. هاریکارە ژ بۆ کێمکرنا فشار و سترێسێ.
2. هاریکارە ژ بۆ بەرگریکرن ل دژی ئوکسێنەران.
3. مەترسیێن تووشبوون ب ئاریشە و نەخۆشیێن گرێدایی دلی کێم دکەت.
4. ب مفایە ژ بۆ کەسێن ئاریشەیێن گرێدایی جگەرێ یێن چەوریێن نە ژ ئەگەرێ کحۆلی پەیدابووین (NAFLD) هەین.
5. هاریکارە ژ بۆ باشترکرنا تەندرۆستیا پیستێ لەشی.
6. ب مفایە ژ بۆ کەسێن ب تەمەن.
7. هاریکارە ژ بۆ باشترکرنا کارێ سیهان.

پێدڤییە رۆژانە چەند رێژە(ملیگرام) ژ ڤیتامین E وەربگری:

| تەمەن | كەسێن نە دووگیان نە شیردەر | ئافرەتێن دووگیان | ئافرەتێن شیردەر |
|---|---|---|---|
| ژ دایکبوونێ هەتا شەش هەیڤییێ | چار ملیگرام | | |
| ٧ - ١٢ هەیڤییێ | پێنج ملیگرام | | |
| ١ - ٣ سالییێ | شەش ملیگرام | | |
| ٤ - ٨ سالییێ | حەفت ملیگرام | | |
| ٩ - ١٣ سالییێ | یازدە ملیگرام | | |
| ١٤ سالی و زێدەتر | پازدە ملیگرام | پازدە ملیگرام | نۆزدە ملیگرام |

پشکنینا ڤیتامین E ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Vitamin E Test
- Vitamin E
- Tocopherol Test
- Alpha-tocopherol Test
- Vitamin E, Serum

## پشکنینا ترشێ فۆلیک Folic Acid Test

مفا ژ پشکنینا Folic Acid دهێتە وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڕێژەیا ترشێ فۆلیک د ناڤ خوینێدا، ترشێ فۆلیک دهێتە هژمارتن ڤیتامین B9، ب گرنگ دهێتە زانین ژ بۆ دروستکرنا خرۆکێن سۆرێن خوینێ یێن تەندروست و کارێ سەرەکیێ خرۆکێن سۆرێن خوینێ ڤەگوهاستنا ئۆکسجینێیە ژ بۆ هەمی لەشی، هەروەسا ترشێ فۆلیک ب گرنگ دهێتە هژمارتن ژ بۆ گەشەکرنا ئاسایی یا زارۆکان د زکێ ژنا دووگیاندا، پێدڤییە هەردوو ڕەگەزێن نێر و مێ ڕۆژانە 400 micrograms وەربگرن ژ ترشێ فۆلیک، ب تایبەت بەری هەیڤەکێ ژ دووگیانبوونێ و وەرگرتنا ڕێژەیەکا باش ژ ترشێ فۆلیک د ماوەیێ دووگیانبوونا ژنێدا دێ زارۆکی ژ ئاریشەیێن زکماکی یێن مێشك و ستریبەندکێ پارێزیت.

ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا ترشێ فۆلیک:

- 6.12 - 38.52 nmol/L



**ب شێوەیەکێ گشتی ژ مفایێن هەبوونا ترشێ فۆلیک یان ڤیتامین B9 د ناڤ لەشیدا:**

1. دروستکرنا خرۆکێن سۆرێن خوینێ.
2. ڕێگرییێ ل نەڕێکی و هەبوونا ئاریشەیان ل دەڤ زارۆکێ ژنا دووگیان دکەت.
3. هاریکاریا چاکبوون و دروستکرنا خانەیێن پیستێ لەشی دکەت.
4. هاریکاریا پاراستن و گەشەیا شانە و ماسۆلکەیێن لەشی دکەت.
5. هاریکارە ژ بۆ کونترۆلکرنا ئاستێ هیمۆگلۆبینی.
6. هاریکارە ژ بۆ کێمکرنا ئەگەرێن تووشـبوون ب نەخۆشـییێن دلی ب تایبەت جەلتەیا دلی.
7. هاریکارە ژ بۆ کێمکرنا خەموکییێ.
8. دبیتە ئەگەرێ کێمکرنا تووشبوونێ ب نەخۆشییا زەهایمەرێ.
9. ب مفایە ژ بۆ دروستکرنا DNA د ناڤ لەشیدا.
10. ڕێگرییێ ل تووشبوون ب پەنجەشێرێ دکەت.




**بۆچی پێدڤییە پشکنینا ترشێ فۆلیک بهێتە ئەنجامدان؟**

نۆژدار دێ داخوازا پشـکنینا Folic Acid کەت ل دەمێ هەبوونا نیشـانێن نەئاسـاییبوونا ڕێژەیا ترشێ فۆلیک.

### نیشانێن کێمبوونا ڕێژەیا ترشێ فۆلیک د ناڤ لەشیدا:

1. زکچوون.
2. قەبزبوون.
3. کێم خوینی، ژ نیشـــانێن کێم خوینییێ: (ماندیبوون، ســـەرئێشـــان، هەســـتکرن ب بێهنتەنگبوونێ، زەربوونا پیستێ لەشی، نەئاساییبوونا لێدانێن دلی و ...هتد).
4. کێمبوونا حەزا خوارنێ.
5. هەوکرنا ئەزمانی.
6. زەربوونا پیستێ لەشی.
7. زوی ژبیرکرن یان ژدەستدانا هزروبیران.
8. سەرئێشان.
9. هەبوونا ئاریشەیان ل دەڤ زارۆکێ ژ نوی ژدایکبووی.
10. بەردەوام هەستکرن ب لاوازبوون و ماندیبوونێ.
11. لاوازبوونا سیستەمێ بەرگرییا لەشی.

### هندەك ژ سەرچاوەیێن دەولەمەند ب ترشێ فۆلیک یان ڤیتامین B9:

- مۆز، پرتەقال، کیڤی، گێزەر، سندی، گیز و فڕەولا.
- ئەڤۆگادروو، سپیناخ و شێلم.
- نیسك، نۆك و باقلك.
- باجان.
- تـــۆڤـــکـــێـــن گولبەڕۆژان.
- باهیڤ.
- مریشك.
- ماسی.
- جگەر.



رامانا ئەنجامێن پشکنینا ترشێ فۆلیک یان ڤیتامین B9:

- ل دەمێ بلندبوونا رێژەیا ئەنجامێ پشکنینێ ژ رێژەیا ئاسایی یا پشکنینێ ب شێوەیەکێ گشتی ئاریشەیێن زۆر مەزن دروست ناکەت، بەلێ ئەگەر یێ هەی ببیتە هۆکار ژ بۆ کێمبوونا رێژەیا ڤیتامین B12 د ناڤ لەشیدا، لەشێ مرۆڤی پێدڤیاتی ب ڤیتامین B12 هەیە ژ بۆ هندێ ب شێوەیەکێ دروست ترشێ فۆلیک بهێتە بکارهینان، ژ بەر هندێ ل دەمێ کێمبوونا رێژەیا ڤیتامین B12 د ناڤ لەشیدا ب شێوەیەکێ دروست ترشێ فۆلیک ناهێتە بکارهینان.

- ل دەمێ کێمبوونا رێژەیا ئەنجامێ پشکنینا ترشێ فۆلیک ژ رێژەیا ئاسایی دبیت ببیتە ئەگەرێ:

- تووشبوون ب کێم خوینییێ.
- هەبوونا ئاریشەیان ل دەمێ هەلمژینێ، یان هەبوونا ئاریشەیان د هەلمژینا ڤیتامین و کانزایاندا.

پشکنینا ترشێ فۆلیک ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Folic Acid Test
- FA Test
- Vitamin B9 Test



## پشکنینا ڤیتامین A

مفا ژ پشکنینا Vitamin A دهێته وەرگرتن ژ بۆ دەستنیشانکرنا ڕێژەیا ڤیتامین A دناڤ خوینێدا، ڤیتامین A دهێته نیاسین ب ڕێتینۆل، ڤیتامین A ب گرنگ و پێدڤی دهێته هژمارتن ژ بۆ لەشی، ڕێتینۆل مادەیەکێ خۆراکییە ژ بۆ تەندرۆستییا پیستێ لەشی و چاڤ و دیتنێ گرنگ و ب مفایە، هەروەسا ژ بۆ تەندرۆستییا گەشەیا هەستییان و پشتەڤانیکرنا سیستەمێ بەرگرییا لەشی دژی هەوکرن و میکرۆبان و گەشەیا زارۆکی د زکێ دەیکا دووگیاندا ب مفایە، بلندبوونا ڕێژەیا ڤیتامین A د شیاندایە ببیتە ئەگەرێ پەیدابوونا نیشانێن وەکی خۆراندنا پیستێ لەشی و سەر ئێشان و وەریانا پرچێ و...هتد، هندەک جاران پشکنینا ڤیتامین A دهێتە ئەنجامدان ل دەمێ هەبوونا بارودۆخێن خراب یان دروست نەهەلمژینا مادەیێن خۆراکی، ژ بۆ پشتراستبوون ژ هەلمژینا ڕێژەیا پێدڤی ژ ڤیتامین A ژ بۆ لەشی.

ڕێژەیا ئاسایی یا پشکنینا ڤیتامین A:

- 0.69 - 2.09 micromol/L یان 20 - 60 mcg/dL



نیشانێن کێمبوونا ڕێژەیا ڤیتامین A دناڤ لەشیدا:



1. هشکبوونا چاڤ و پیست، پرچێ.
2. ستویربوونا پیستێ لەشی.
3. هەبوونا برینان ل سەر پیستێ لەشی.
4. کێمخوینی.
5. دووبارەبوونا هەوکرنان.

نیشانێن بلندبوونا ڕێژەیا ڤیتامین A دناڤ لەشیدا:

1. سەرئێشان.
2. هەلاڤێتن.
3. هەستکرن ب ماندیبوون و لاوازبوونێ.
4. گێژبوون.
5. تورەبوون.
6. ئێشانا ماسولکەیان.
7. ئێشانا گەهـ و هەستییان.
8. وەریانا پرچێ.
9. خۆریان.
10. تێکچوونا کارێ جگەرێ.
11. هەوکرنا ئەزمانی.

هندەک ژ نەخۆشییێن پەیوەندیدار ب کێم هەلمژینا ڤیتامین A:

- نەخۆشییا سیلیاک(گەنمی) Celiac Disease (پشکنینا نەخۆشییا سیلیاک (گەنمی) ل بەشێ پشکنینێن گرێدایی سیستەمێ بەرگرییا لەشی دژی خۆ هاتییە شرۆڤەکرن و بەحسکرن ب شێوەیەکێ تێر و تەسەل).

- نەخۆشییا ڕیخۆلە تورە (متلازمة القولون العصبي).
- نەخۆشییا کرۆنس (جۆرەکە ژ نەخۆشییێن گرێدایی ڕیڤیکان).

سەرچاوەیێن دەولەمەند ب ڤیتامین A:




- گێزەر.
- سپیناخ.
- برۆکلی.
- باجان.
- فلفل.
- مانگو.
- مشمش.
- هێک، شیر و ماست.
- پەنیر.
- ماسی.
- باهیڤ.

پشکنینا ڤیتامین A ب ڤان شێوازان دهێتە نڤیسین:

- Vitamin A Test
- Vitamin A
- Vit.A
- Retinol Test

## کورتییەک ژ ژیانا نڤیسەر و بەرهەڤکەرێ پەرتووکێ



- رەیان صەدیق ئەحمەد سلێڤانەیی
- زمان (کوردی، عەرەبی، ئینگلیزی).
- خواندنا سەرەتایی ل قوتابخانەیێن بەهدینان و میتان ب پلەیێن نایاب ب دوماهیک ئینایە، خواندنا ناڤنجی و ئامادەیی ل قوتابخانەیێن زرکا و برایەتی ب پلەیێن بەرز ب دوماهیک ئینایە.
- دەرچوویێ کولیژا زانستێن تەندرۆستی بەشێ شرۆڤەکرنا نەخۆشییانە (ژ پازدە کەسێن ئێکەم بوو).
- باوەرناما بکالوریوس ب شرۆڤەکرنا نەخۆشییان (طب المختبرات) هەیە.
- ماموستایە ل کولیژا زانستێن تەندرۆستی ژ بۆ وانەیێن پراکتیک (عملي) ژ بۆ هەرسێک بەشێن (شرۆڤەکرنا نەخۆشییان، مایکرو بایولوجی، کیمیا ژیانی یا کلینیکی) ل زانکویا جیهان - دهۆک.
- سەرنڤیسەرێ بابەتێن زانستی و پزیشکییە ل گوڤارا (کوردش یا زانستی - Magazine Kurdish Science).
- ئێکەمین کەسە ل سەرانسەری هەرێما کۆردستانێ (بادینان) پەرتووکەک دەربارەی تاقیگەهـ و شرۆڤەکرنا پشکنینێن پزیشکی بەرهەڤکری و نڤێسایی و چاپکری (هەروەسا بۆ ئێکەمین پەرتووکا پزیشکی ل سەرانسەری کۆردستانێ د کێمترین دەمدا چاپا ئێکێ ب دوماهیک هات).
- پەرتووکا (تاقیگەهـ و شرۆڤەکرنا پشکنینێن پزیشکی) ژ بەرهەڤکرن و نڤیسینا رەیان صەدیق ئەحمەد سلێڤانەیی دبیتە ئێکەمین پەرتووکا پزیشکی ل سەرانسەری کۆردستانێ (بادینان) دووبارە پشتی چاپا ئێکێ د ماوەیەکێ گەلەک کورتدا ب دوماهیک هاتی، چاپا دوویێ هاتە چاپکرن و نوکە ل بەردەستێ خواندەڤانان دایە.
- پەرتووکا (تاقیگەهـ و شرۆڤەکرنا پشکنینێن پزیشکی) ژ بەرهەڤکرن و نڤیسینا رەیان صەدیق ئەحمەد سلێڤانەیی دبیتە ئێکەمین پەرتووکا پزیشکی

ل سەرانسەری کۆردستان و ئیراق و پتریا وەلاتێن ڕۆژهەلاتا ناڤەڕاست کو ژ دوو بەرگان پێکدهێت و پتر ژ ٥٦٥ لاپەڕان.

- ئێکەمین کەسە ل سەرانسەری هەرێما کۆردستانێ (بادینان) پەرتووکەک دەربارەی ڤێراگەهشتنێن دەستپێکێ (إسعافات الاولية) ئامادە و بەرهەڤکری، نڤێسایی و چاپکری.
- پتر ژ پازدە باوەرنامەیێن (ناڤخۆیی - دەرەکی) هەتا نوکە ب دەستڤەئینناینە دەربارەی بابەتێن جودا جودایێن گرێدایی شرۆڤەکرنا پشکنینان و تاقیگەهێن پزیشکی.
- دەهـ باوەرنامەیێن (ناڤخۆیی - دەرەکی) هەتا نوکە ب دەستڤەئینناینە دەربارەی ڤێراگەهشتنێن دەستپێکی (إسعافات أولية).
- ڕاهێنەرە د بوارێ شرۆڤەکرنا زانستێ تاقیگەهێن پزیشکی (تیوری - پراکتیک).
- ڕاهێنەرە د بوارێ ڤێراگەهشتنێن دەستپێکی (إسعافات أولية) (تیوری - پراکتیک).
- دگەل چەندین ڕێکخراوێن ناڤخۆ و بیانی کارکرییە وەکی ڕاهێنەر د بوارێن گشتی یێن دەربارەی ساخلەمی و تەندرۆستیییێدا و ب تایبەتی د بوارێن شرۆڤەکرنا زانستێ تاقیگەهێن پزیشکی و ڤێراگەهشتنێن دەستپێکی (إسعافات أولية).
- پشکداری دەهان خۆل و کورس و سمینار و کۆر و وۆرک شۆپێن دەربارەی بابەتێن زانستی و پزیشکی یێن جوراوجۆر و گەشەپێدانێ کرییە، پشکداری دەهان کارێن خێرخوازی کرییە.
- ب دەهان باوەرنامەیێن گرێدایی بابەتێن جوراوجۆرێن ئایینی و گەشەپێدان و ...هتد ب دەستڤەئینناینە.
- ب دەهان سمینار پێشکێشکرینە دەربارەی بابەتێن گرێدایی ساخلەمی و تەندرۆستیییێ ب شێوەیەکێ گشتی و ب تایبەتی ژیک دەربارەی زانستێ تاقیگەهێن پزیشکی و ڤێراگەهشتنێن دەستپێکی (إسعافات أولية) ب هەردووک شێوازێن (تیوری - پراکتیک).
- بەردەوامە د خزمەتکرنا نەخۆشاندا ل نەخۆشخانەیان (حکومی - تایبەت).

